نجم الدين فرج أحمد

# ٦ شەش پێشەواکەی فەرمودە

بوخاری

موسلیم

ئەبوداود

ترمزی

نەسائی

ئیبنوماجە

منتدى إقرأ الثقافي
www.iqra.ahlamontada.com

التفسير

منتدى إقرأ الثقافي

# شەش پێشەواکەی فەرمودە

بوخـــاری
موسلیـــم
ئەبـو داود
ترمـــزی
نەسـائـی
ئیبنوماجـە

نجم الدين فرج احمد

منتدى إقرأ الثقافي

مافی لەچاپدانەوەی پارێزراوە بۆ
**نوسینگەی تەفسیر**

| | |
|---|---|
| ناوی کـتێــــــب: | شەش پێشەواکەی فەرموده |
| نوســـــــەر: | نجم الدين فرج احمد |
| بـلاوکردنــــەوەی: | نوسینگەی تەفسیر بۆ بڵاوکردنەوەو ڕاگەیاندن/ هەولێر |
| نەخشەسازی ناوەوە: | شنۆ حمدامین |
| خـــــــە ت: | نەوزاد کۆیی |
| بـــــــەرگ: | ئەمیـن مخـلص |
| نۆرە و ساڵی چــاپ: | یەکەم ١٤٣١ك – ٢٠١٠ز |
| تـــــــیراژ: | (٢٠٠٠) دانە |

لە بەڕێوەبەرایەتی کتێبخانەی گشتی سلێمانی، ژمارەی سپاردنی ( ١٠١٨ ) ی ساڵی ٢٠١٠ی دراوەتێ

تەفسیر
بۆ بڵاوکردنەوە و ڕاگەیاندن
هەولێر- شەقامی دادگا - ژێر تونێلی [illegible] پالاس
ت : ٢٢٢١٦٩٥ - ٢٢٢٠٩٠٨ - ١٥١٨[illegible]٣٨
مۆبایل : ٠٧٥٠ ٤٦٠ ٥١ ٢٢ - ٠٧٧٠ ١٣٨ ٧٢ ٩١
tafseeroffice@yahoo.com
tafseeroffice@maktoob.com
altafseer@hotmail.com

www.al-tafseer.com

منتدى إقرأ الثقافي

بسم الله الرحمن الرحيم

انَّ الحَمْدَ للهِ نَحْمَدُهُ ونَستَعِينُهُ ونَستَغفِرُهُ، ونَعوذُ بِاللهِ مِنْ شُرورِ أنْفُسِنا ومِنْ سَيِّئاتِ أعْمالِنا، مَنْ يَهْدِهِ اللهُ فَلا مُضِلَّ لَهُ، وَمَنْ يُضْلِلِ فَلا هادِيَ لَهُ. وأشْهَدُ أنْ لا الهَ إلا اللهُ وأشهَدُ أنَّ محمداً عَبدُهُ ورسُولُهُ.

يا أيُّها الذينَ آمَنوا اتَّقُوا اللهَ حَقَّ تُقاتِهِ ولا تَموتُنَّ إلاَّ وأنتُمْ مُسلِمونَ

يا أيُّها النَّاسُ اتَّقُوا رَبَّكُمَ الذي خَلَقَكُمْ مِنْ نَفْسٍ واحِدةٍ وخَلَقَ مِنها زَوجَها وبَثَّ مِنهُما رِجَالاً كَثيراً ونِساءً واتَّقُوا اللهَ الذي تَساءَلُونَ بِهِ والارْحَامَ إنَّ اللهَ كانَ عليكُمْ رَقيباً

يا أيُّها الذينَ آمنوا اتقوا اللهَ وقُولوا قَولاً سَديداً، يُصْلِحْ لَكُمْ أعمالَكُمْ ويَغفِرْ لَكُمْ ذُنُوبَكُمْ وَمَنْ يُطِعِ اللهَ ورسولَهُ فَقَدْ فَازَ فَوزاً عَظيماً

أمَّا بعدُ: فإنَّ أصْدَقَ الحَديثِ كِتابُ اللهِ، وخَيرَ الهَدي هَدْيُ محمدٍ صلى الله عليه وسلم وشَرَّ الامُورِ مُحْدَثاتُها، وكُلَّ مُحْدَثَةٍ بِدْعَةٌ وكُلَّ بِدْعَةٍ ضَلالَةٌ، وكُلَّ ضَلالَةٍ في النَّارِ

منتدى إقرأ الثقافي

# پێشەکی

پێشەوایانی فەرمودەوانی: کە ناوی ئەم شەشەیان:(بوخاری و موسلیم و ئەبوداودو ترمزی و نەسائی و ئیبنوماجە) زیاتر بەناوبانگە، فەزڵی گەورەیان، تا قیامەت بەسەر نەوە بە نەوەی ئوممەتی موسوڵمانەوە هەیە، چونکە ئەو هەمو فەرمودانەی پێغەمبەری خوایانﷺ بۆ کۆکردونەتەوەو پاراستویانن، یەکێکی وەکو ئیمام بوخاری، کە زیاتر لە نۆسەد هەزار فەرمودەی لەبەربوەو، لە تەمەنی پیرۆزی خۆیدا، نەوەد هەزار فەقێ فەرمودەکانی سەحیحی بوخارییان لێوە وەرگرتوە! لە دوای تەمەنی پیرۆزی و، تا ڕۆژی دوایی دەبێ چەند هەزاری تر، ئەم فەرمودانەی لێوە وەربگرێت، کە ئێستا لە دو توێی کتێبدا کۆکراونەتەوە، یان لەسەر سیدین، یان بە ئامێری نوێتر بڵاو دەکرێنەوەو ئاسان دەخرێنەوە بەردەست موسوڵمانان.. یەکێکی تری وەکو ئیمام موسلیم، کە دوازدە هەزار فەرمودەی لە دو توێی کتێبدا بۆ ئەم ئوممەتە نوسیوەتەوەو، خستوێتیە بەر دەست نەوە بە نەوەی ئوممەتەکە، دەبێت چ ئاست و ڕادەیەك بۆ فەزڵی ئەم پیاوانە دابنرێت؟! بێگومان زۆر زۆر...

پێشەوایانی فەرمودە، لە پێشەوایانی شەرعناسیی(فیقە) زیاتر بون، ئەم پێشەوا بەرێزانەش ناودارتر بون، دەنا زانایانی فەرمودەوانی زۆر زۆرن، یەکێکی وەکو ئیمام ئەبو زەرعە، کە زۆرینەمان ناویمان نەبیستوە! لە تەمەنی(٣٢) سیودو ساڵیدا دەیگوت، دوسەد هەزار فەرمودەم لەبەرە وەکو، کە(قل هو الله) احدم لەبەرە! ئەم ئیمامە بەرێزە، زیاتر لە شەش سەد هەزار فەرمودەی لەبەر بوەو، وەکو ئیمام بوخاری و موسلیمیش بەناوبانگ نەبوە...

منتدى إقرأ الثقافي

خوێندنی سیرەی ئەم زاتە پاكانە، بۆ ئێستای ئێمە زۆر پێویستە، بۆ ناسینیان، بۆ قەدرزانینیان، بە بەرێزەوە ناو هێنانیان، بۆ لێوە فێربونیان، بۆ ئیقتیدا پێكردنیان.

دیراسە كردنی ژیانی ئەم زانا بەرێزانە، پێویستە بەرفراوانتر بێت، تا شارەزایی زیاتر دەربارەیان بلاو ببێتەوە، دەربارەی زۆری زانیارییان، تەقواو دینداریيان، جوهدو جیهادیان، نوسین و بەرهەمیان... هیممەتی بەرزی فێربون و فێركردنەوەیان.. بەلام چی بكەین، كە ئەهلی ئیسلام لە كوردستانی ئێمەدا، ئەوەندە لە روی زانستی شەرعیەوە دوا كەوتون، كە تەنانەت زۆرینەی مەلاكانیشمان، نازانن ئەم ئیمامە بەرێزانە كێن و بەرهەمەكانیان چیە ؟! ئێمە لە ناچاریدا ئەم كورتە باسەمان دەربارەی ئەو زانایانەی، فەرمودەوانی بۆ نوسیوە، تا وەكو رێرەوێك بێت و قوتابیانی شەرع و خوێنەران بیخوێنن و، ویست و ئیرادەی سۆراغ و، بەدواداچونی زانستی شەرعییان لا بەهێزتر بكرێت... لەم كاتەی ئێستاماندا هەر ئەوەندەمان پێكراوە، بەلكو خوای گەورە كات و هەلی تریشمان بۆ برەخسێنێت و، بتوانین لەسەر زانایانی تری فەرمودەوانی بنوسین و بیخەینە بەر دەست خوێنەرانی كورد... خوا ئەو دەرفەتەمان بۆ برەخسێنێت.. ئامین..

وصلى الله على سيدنا و حبيبنا محمد وعلى آله و صحبه و سلم تسليما

نجم الدين فرج احمد

ئۆسلۆ - نەرویج

شەعبانی ١٤٣٠ ك / تەممووزی ٢٠٠٩ ز

منتدى إقرأ الثقافي

# ئیمام بوخاری( رحمه الله )

## (١٩٤ ـ ٢٥٦ ك)

ئەبو ئومامەتول باهیلی ـ خوا لێی ڕازی بێت ـ دەڵێ: باسی دو کەس لای پێغەمبەرﷺ کرا، یەکیان هەر خەریکی خواپەرستییەو، ئەوی تریان زانایە، پێغەمبەرﷺ فەرموی: (فَضْلُ العالِمِ علَى العَابِدِ كَفَضْلِي عَلَى أَدْنَاكُمْ) واتە: پلەی گەورەیی زانا بەسەر پلەی گەورەیی خواپەرستدا، وەکو پلەی گەورەیی من وایە بەسەر کەمترین کەستاندا، پاشان فەرموی: ...(إِنَّ اللهَ ومَلائكتَهُ وأَهْلَ السَّمَواتِ والارضِ حَتَّى النَّمْلَةُ فِي جُحْرِهَا، وحَتَّى الحُوتُ، لَيُصَلُّونَ عَلَى مُعَلِّمِي النَّاسِ الخيرَ) ترمزی گێڕاوێتیەوەو گوتویەتی: حەدیسێکی حەسەن و سەحیحە[١]. واتە: بە تەئکید خوای گەورە فریشتەکانی، هەروەها هەمو دانیشتوانی ئاسمانەکان و زەوی، تەنانەت مێروله له ناو کونەکەی خۆیداو، ماسیش دوعا بۆ ئەو کەسە دەکەن کە مامۆستای خێرخوازی و ئامۆژگاری خەڵکی بۆ کاری چاکە دەکات. (صحيح الترغيب والترهيب) بـ١ /لا ٣٧(ژمارە ٧٨).

ـ ئیمام ئەحمەدی کوڕی حەنبەل گوتویەتی: (هەمو خۆراسان کەسێکی تری وەکو محمدی کوڕی ئیسماعیل(واتە بوخاری) پێ نەگەیاندوە).

ـ ئیمام ئیبنول مەدینی، مامۆستای بوخاری گوتویەتی: (بوخاری کەسی تری وەکو خۆی نەدیوە).

ـ ئیمام موسلیم بە ئیمام بوخاری دەگوت: (کەس تۆ نابوغزێنێت، مەگەر کەسێکی بەغیل و حەسود بێت، شایەتی ئەوە دەدەم، کە یەکێکی تری وەکو تۆ

---

١ واتە: هەم لە ڕوی ڕاستی دەقی حەدیسەکەوە هەم لە ڕێگاکانی گێڕانەوەوە پلەی حەسەنی دەدرێتێ و، لە لایەکی ترەوە پلەی سەحیحی دەدرێتێ.

منتدى إقرأ الثقافي

لەم دنیایەدا نییە).

ـ ئیمام ئیبنو خوزەیمە دەیگوت: (لە ژێر ئەم ئاسمانە شینەدا، کەسێکی تری تێدا نییە شارەزای حەدیسی پێغەمبەرﷺ بێت، وەکو محمەدی کوڕی ئیسماعیل).

ـ ئیمام زەهەبی گوتی: (بوخاری، شیخ الاسلام، پێشەوای حافزان[1]، ئەوی، کە پێشەوای زیرەکییە، پێشەوای زانست و لەخواترسان و خواپەرستییە، خۆزگە باسی لایەنە چاکەکانی ژیانی دەخرایە دو توێی کتێبێکی گەورەوە، جا دەبینرا باسی چەند سەیری تێدا دەبو ).

ـ ئیمام ئیبنو حەجەری عەسقەلانی دەڵێ:(گەرئەو باس و خواسانەی ئیمام بوخاری بکرێتەوە، کە ئەو زانایانەی دوای خۆی کردویانە، دەروازەیەك دەبو، دانەدەخرا... لاپەڕە کۆتایی پێ دێت و، هەناسەی تێدا سوار دەبێت، بوخاری دەریایەکە کەناری نییە).

ـ محمد بن یوسفی ئەلفەریری ـ یەکێکە لەوانەی، کە حەدیسەکانی بوخارییان گێڕاوەتەوە ـ دەیگوت: (جارێك لە خەونمدا بە خزمەت پێغەمبەری نازدار گەیشتمﷺ، فەرموی: ئەوە بۆ کوێ؟ عەرزم کرد: دەچمە خزمەت محمدی کوڕی ئیسماعیل، فەرموی: (اِقْرَءْهُ مِنِّي السَّلاَمَ) واتە: سڵاوی منیشی پێ بگەێنە.

---

١ مەبەست لەوە نیە، کە چاوی کوێر بوبێت، وەکو ئێستا لە کوردەواریدا یەکێك کوێر بێت پێی دەڵێن حافز!! چونکە بە داخەوە لە ناو کوردا، هەر ئەو کەسانەی چاویان کوێر بوە قورئانیان لەبەر کردوە!! بۆیە وای لێ هاتوە، کە حافز یەعنی کوێرو، کوێریش یەعنی حافز!! لە فەرمودەوانیدا بە زانایەك وتراوە حافز، کە چەندین هەزار حەدیسی لەبەر بوبێت، زانایان هەندێکیان گوتویانە لانی کەم دەبێت دە هەزار حەدیسی بە سەنەدو دەق زانینەوە(درایە وروایە) لەبەر بێت ئینجا پێی دەوترێت حافز، هەندێکی تر گوتویانە، دەبێت سێ سەد هەزار حەدیسی لەبەر بێت ئینجا شایانی ئەوەیە پێی بوترێت حافز!!! (تذکرة الحفاظ وتبصرة الایقاظ / نوسینی یوسف عبدالهادي ٩٠٩ ك).

منتدى إقرأ الثقافي

# ناو و ڕەچەڵەکی

شیخی ئیسلام و پێشەوای حافزان و ئەمیری موسوڵمانان لە فەرمودەوانیدا: ئەبو عبدالله محمدی کوڕی ئیسماعیل، کوڕی ئیبراهیم، کوڕی ئەلموغیرەی کوڕی بەردیزیەی ئەلجەعفی.

بەردیزیەی[1] باپیری، لەسەر دەستی کەسێکی تیرەی ئەلجەعفی[2] موسوڵمان بو، بۆیە نەسەبی بۆتە ئەلجەعفی.

بوخاری: خەڵکی شاری بوخارایە، کە گەورەترین شاری بەناوبانگی ئەو سەردەمەی وڵاتانی پشت روبار(ما وراو النهر: مەبەست لە روباری جەیحونە) بو، بوخارا، کە دەکەوێتە رۆژئاوای ئۆزبەکستانەوە، پێش زایین دروست کراوەو، ئیسلام لە ساڵی نەوەدی کۆچیدا چوە ناوی، ئیتر بوە بەیەکێك لە شارە سەرەکیەکانی زانست و شارستانێتی ئیسلامی..

ئیمام بوخاری، خاوەن سەحیحی بوخارییە، کە لە وەسفی حەدیسێکدا وترا: لە الصحيح دا هەیە، یەعنی لە سەحیحی بوخاری !! سەیری ئەم پلەو ناو ناوبانگەو ئەم شەهادە بەرزە !!

ـ محمد(ئیمام بوخاری) بە منداڵی چاوی نابینا بو، باوکیشی زانای شەرع بو، زو کۆچی دوایی کردبو، دایکی زۆری خەفەت لە کوێرێتی کوڕەکەی دەخوارد، کە ناتوانێت وەکو باوکی ببێتەوە بە زانای شەرع.. دەڵێن دایکی جارێك پارچە پێستەیەکی لە کتێبخانەکەی باوکی بوخاریدا دیوە، کە حەدیسێکی لەسەر نوسراوە، خەم و پەژارە دایگرتوە لەوەی، کوڕەکەی، کە گەورە دەبێت، ناتوانێت

---

١ بەردیزیەیە نەك بەردیزبە، وشەیەکی فارسی کۆنەو بە مانای چێنەر دێت.

٢ تیرەی جەعفی کوڕی سەعد، کە باپیرە گەورەی هۆزی ئەلجەعفییە لە یەمەن، ئەو کاتە ئەم بەردیزیەیە لەسەر دەستی ئەم جەعفیە موسوڵمان بوە، کە ئەو کاتە والی خەلیفەی عەبباسی بوە لە بوخارا.

منتدى إقرأ الثقافي

ئـەم دەسـتو خەتـەی بـاوکی بخوێنێتـەوە، بۆیـە شـەوڕۆژ دوعـای کـردوە، خـوای گەورە چاوی بوخاری چاك کاتەوە، سـاڵێکی نـەبردوە، خـوای گـەورە چـاوی چـا کردۆتەوە !!

بەردزیبەی باپیرە گەورەی فارس بو، مەجوسی بـو، لەسـەر دیـنی فارسـەکان بو، بەڵام موغیرەی کوڕی(کە باپیری بوخاری دەکات) لەسەر دەستی ئەلیەمانول جەعفی موسوڵمان بو، کە ئەو سەردەمە والی بوخارا بو، ئیدی نەسەبەکەی بـو بە جەعفی.. ئیسماعیلی باوکیشی زانایەکی بەڕێز بو، بوە فەقێی ئیبنو زەیـدو ئیمـام مالیـك لـە مەدینـە، دوایـیش، کـە خـۆی پـێ گەیـشت، بـوە مامۆسـتای عێراقیەکان. ئیبنو حیببان لە کتێبی(کتاب الثقات)ەکەیـدا نـاوی زۆر لـە فـەقێ عێراقیـەکانی بـردوە. بـاوکی بـەڕێزی لەگـەڵ زانـستی شەرعییـشدا، تـەقواو دینداریيەکی ساغی کۆکردبۆوە، لە خواترس بو، بایـەخی زۆر بـە دورەپـەرێزی حەرامدا بو، لە کاتی سەرە مەرگیـدا لێـی دەگێڕنـەوە، کـە گـوتی: (وا نـازانم لـە هـەمو سـەروەت و سـامانەکەمدا، درهـەمێکی نـەك حـەرام، بـەڵکو گومـان لێکراویشی تێدا بێت ).

کەوا بو ئیمام بوخاری ئازیز، لەماڵێکی ئاوا ئەهلی تەقواو دینداریدا لـەدایك بوەو پێگەیشتوە، ئەو دایکە ساڵحە دوعاگیرایـە شـیری داوەتـێ و گۆشـی کـردوە، بۆیە جێی سەرسوڕمان نییە، خۆشی ئـاوا ئـەهلی تـەقواو دینـداری و، پێـشەوای زانستی شەرعی دەرچێت.

## لەدایك بون و گەشە کردنی:

ئیمـام بوخـاری دوای نوێـژی هـەینی، رۆژی ١٣ ی شـەوالی ١٩٤ ی کۆچـی، لـە بوخارا لەدایك بوە. باوکی هەر لەسەرەتای منداڵی ئەوەوە، کۆچـی دوایـی کـرد، بـەڵام دایکـی، کـە بـوە سەرپەرشـتیارو پـەروەردەکاری، چـاکی گرتـە خـۆی و چاکیـشی پێگەیانـد، میراتەکـەی بـاوکی، هـەر بـۆ پێگەیانـدنی بوخـاری بـەکار هێنایەوە..

منتدى إقرأ الثقافي

## زیتی و وریایی زەمانی منداڵی

هەر لەو کاتەی خرایە حوجرە، خوای پەروەدگار دڵ و هۆشێکی زۆر بەهێزو، بیرێکی تیژی وای پێ بەخشی کە هەر لە تەمەنی دە ساڵیدا زۆر ئاسان بکەوێتە لەبەر کردنی هەزاران حەدیس، کە گەیشتیشە شازدە ساڵی، کتێبەکانی عبداللەی کوڕی موبارەك و، وەکیعی کوڕی جەڕاحی بە لەبەر کردن لەبەر کردبو !! جگە لەو شارەزاییە قوڵەی لە زانستیە شەرعیەکان و زمانداا پەیدای کرد، لە ڕاوبۆچونی ئەهلی رەئی و بنەماو بنچینەی مەزهەبەکانیان، زۆر زو سەری دەرچو.. لە لایەکەوە شارەزای بنەماکانی مەزهەبی ئیمام ئەبو حەنیفە بو، کە یەکەمین سەرمەزهەبی ئەهلی سوننەتەو بەناوبانگ بوە بەمەدرەسەی کوفە، یان مەدرەسەی رەئی.. لە لایەکی ترەوە شارەزای بنەمای مەزهەبی ئیمام مالیك بو، کە بە مەدرەسەی مەدینەو مەدرەسەی حەدیس ناسرابو..

## شێوەو ڕواڵەت و تەقوای

ئیمام بوخاری بەلەباریکەیەکی قەد مام ناوەندی بو، نە درێژ بو، نە کورت، زۆر زاهید بو، کۆڵی هێندە بە دنیاوە هەڵ نەگرتبو، زۆریشی لەو سامانە زۆرەی، کە لە باوکی رەحمەتییەوەی بۆی مابۆوە، هەر کردی بە خێر و بەخشییەوە، پیاوێکی کەمخۆر بو، لە سەخاوەت و خێرخوازیدا، کەم وێنە بو.. دەڵێن جاری وا هەبوە، هەر دو گوێز، یان سێ دەنکە چوالە بادەمی دەکردە ژەمێکی خواردنی !!

ئیمام بوخاری ﷺ دەڵێ: لەو کاتەوەی زانیومە غەیبەت حەرامە، غەیبەتی یەك کەسم نەکردوە.. زو زو دەشی گوت: ئومێدی ئەوەم هەیە، کە لە رۆژی قیامەتدا، خوای گەورە لەسەر غەیبەتیھیچ کەس موحاسەبەم ناکات..

منتدى إقرأ الثقافي

## بلیمەتی تیرئەندازی

ئیمام بوخاری فێری بەکارهێنانی رم و تیر بو، زۆریشی مەشق لەسەر دەکردن، مەشقەوانەکەی دەڵێت: بوخاری زۆر بە دیققەت مەشقی دەکرد، لە هەمو ماوەی تیرئەندازییەکەیدا، تەنها دو جار نیشانی نەپێکاوە! هەمو مەبەستیشی لەم تیر ئەندازی و مەشقە، بەرگری لە ئیسلام و، جیهاد بو دژی کافران و دوژمنانی خوا.

سەیری ئەو حاڵی بونە لە هەمو لایەنەکانی ئیسلام.. ئەم کەڵەپیاوەی زانست و شەرع، کە هەر دەتوت لە منداڵیەوە، تەنها بۆ فەرمودەوانی خەڵق کراوە، کەچی مەشقی چەکداریشی فەرامۆش نەکردوە چونکە دەیزانی ئامادەباشیی بۆ جیهاد، فەرزە، دەیزانی مادام لە سێ حاڵەتدا جیهاد دەبێتە فەرزی عەین(واتە هەمو کەسێکی موسوڵمانی باڵغ و ئاقڵ، دەبێت بەشداریی تێدا بکات) کەوابو، حەتمەن دەبێت هەمو موسوڵمانێك خۆ ئامادە کردن و مەشق کردن، لەسەر بەکارهێنانی چەك و مەشقی سەربازی فێر ببێت.. هەر لەبەر ئەم تێگەیشتنەیەتی، کە دەبینین ئیمام بوخاری، ئەم دوعایەی خستۆتە کتاب الجهادی سەحیحەکەی خۆیەوە !!(اللهُمَّ إنِّي أعُوذُ بِكَ مِنْ الْعَجْزِ والْكَسَلِ وأعُوذُ بِكَ مِنْ غَلَبَةِ الدَّينِ و قَهْرِ الرِّجَالِ ). واتە: خوایە، من پەنا بە جەنابتان دەگرم لە بێ توانایی و لە تەمبەڵی، لە کەڵەکە بونی قەرز لەسەرم و، لە ژێر دەستەیی پیاوانی دەسەڵاتدار.. چونکە دەیزانی هەر یەك لەم چوار کێشە ناوبراوە، دەبنە بەربەستی رێی جیهاد کردن..

## زانیاری و بیرتیژییەکەی

ئیمام بوخاری یەکێك بو لە نیشانەکانی کارزانی و کارجوانی و گەورەیی خوا، دەڵێن: ئەو کاتەی کە هێشتا منداڵ بو، حەفتا هەزار حەدیسی لەبەر بوە

منتدى إقرأ الثقافي

!!! دەڵێن، كە یەك جار سەیری لاپەڕە كتێبی دەكرد، لەبەری دەكرد! سەیر نییە بۆ كەسێك، كە بڵێ: سەد هەزار حەدیسی سەحیح و، دوسەد هەزار حەدیسی غەیرە سەحیحم لەبەرە... ئەم كتێبەشم(مەبەستی لە سەحیحەكەی خۆیەتی) لە كۆی شەش سەد هەزار حەدیس كۆكردۆتەوە.. چونكە ئیمام بوخاری و مامۆستاكەی، كە ئیمام ئەحمەد بن حەنبەلە و قوتابیەكەی، كە ئیمام موسلیمە، لەگەڵ ئیمام ئەبو زەرعە، تەنها چوار كەسانێكن لە مێژوی ئوممەتی ئیسلامدا، كە یەكی شەش سەد هەزار حەدیسیان زیاتر لەبەر بوە !!

ئیمام بوخاری دەڵێ: جارێك چوم بۆ بەڵخ(لە ئەفغانستانی ئەمڕۆیە )، داوایان كرد لە دەرسی هەر زانایەك، كە حەدیسم لێوە وەرگرتوە، حەدیسێكیان بۆ بهێنمەوە، هەر لەو مەجلیسەدا، هەزار حەدیسم لە هەزار مامۆستای خۆم گێڕایەوە...

دەڵێ: جارێك لە كۆڕی دەرسدا بوین، باسی یاوەرو هاوڕێكانی ئەنەسی كوڕی مالیك كرا، هەر ئەو ساتە سێ سەد هاوڕێی كەوتەوە یادم. جا سەیری موعجیزەی خەڵقی خوایی.. ئەمە گەورەیی و كارزانی خوای گەورەیەو، سەرەتای پێگەیاندنی ئەم چیایەی ئوممەتی ئیسلامە !! بڕوانە ئەو بیرتیژیی و زانایيە، ئینجا بگەڕێرەوە سەر تەقواو دینی و سەر بێ هەواو فیزیی، دوای ئەویش سەیری زوهدی دونیاییەكەی كەرەوە !! ئەمانە پێشەوای ئێمەن و، خەڵكانێكیش دەیانەوێت ڕێمان پێ بزر كەن و، بمانخەنە دوای عەلەمانیەكی بیر كول !!

## گەشتی زانست و گەڕانی

ئیمام بوخاری لە زۆر گەڕانیدا، لە جوگرافیاناسە گەشتیارەكانی وەكو ئیبنو بەتوتە چوە، ناوچەو شاری گرنگ و مەدرەسە نەماوە بۆی نەچوبێت. خۆی دەڵێ: دو جار چومەتە شام و میسرو جەزیرە (مەبەستی لە سوریاو عێراق و

منتدى إقرأ الثقافي

توركيا)ى ئەمڕۆيە، كە كەوتونەتە نێوان ديجلەو فوراتـەوە) چوار جاريش بـۆ بەسـرە، شـەش سـاڵيش لـە حيجاز بـوم، ناشـزانم چـەند جـار چومەتە كوفـەو بەغداد و، لە خزمەت فەرمودەوانانيدا بوم...

خـەتيبى بەغـدادى‌ﷺ دەڵـێ: بوخـارى بـۆ كۆكردنـەوەى حـەديس، چـۆتە خۆراسان و، هەمو شارەكانى عێراق و حيجازو شام و ميسرو، چەندەها جاريش هاتۆتە بەغدا..

ئيمام ئيبنول حەجەرى‌ﷺ دەڵێ: كە لە مەككە گەڕايەوە، ئيدى ڕوى كـردە هەمو ئەو جێگايانەى دەيزانى ئەهلى حەديسيان لێيە، بۆيە سـەفەرى كـرد بـۆ بەڵخ و نەيسابور(ئێستا لە ئێرانداِيەو عايدى پارێزگاى مەشهەدە) ڕەى(شارێكى گەورەو گرنگ بو نزيك تـاران، ئاسەوارێكى كـەمى مـاوە) هـەروەها بـۆ بەغـداو بەسـرەو كوفـەو مەدينـەو واسـيت(لـە نێـوان بەسـرەو كوفەدايـە) و ديمەشـق و عەسقەلان(نزيك غەززەيە لە فەلەستين) هـەروەها حيميـێ(لـە سـوريايە) وهـى تريش...

## مامۆستاكانى بوخارى

ئيمام بوخارى بە خزمەت هەمو كەڵەپياوان و، زانـا شەرعناسـە گـەورەكانى زەمانى خۆى گەيشتوەو دەرسى لـێ وەرگرتـون. ئيمـام ئيبنـول حەجـەر لێيـەوە دەگێڕێتەوە، كە گوتويـەتى: تـەنها ئـەو زانايانـەى شـارەزاى حـەديس بـون، مـن حەديسم لێ وەرگرتـون ١٠٨٠ هـەزارو هەشـتا فـەرمودەوان بـون.(هـدي السـاري - مقدمـة صـحيح البخـاري/ابـن حجـر ل ٤٧٩) دەربارەشـيان گوتويـەتى: حەديسـى هـيچ زانايـەكم وەرنـەگرتوە، ئەگـەر بـاوەڕى وا نـەبو بێـت كـە بـاوەڕ: گوفتـارو كردارە.. هەروەها دەڵێ: هيچ كەس نابێتە زانا، تا لە كەسانى بەرزتر لە خـۆى و، لە هى وەكو خۆى و لە هى خوار خۆيـەوە فێـر نـەبێت و، لێيانـەوە ريوايـەت نەكات.. بۆيە دەبينيت دواى ئەوەى لە شـارەكەى خـۆى، لـە بوخـارا زانسـتى لـە

منتدى إقرأ الثقافي

گەورە زانایانی ئەوێ فێر بو، وەکو محمەدی کوڕی سەلام و ئەلمەسنیدی و محمەدی کوڕی یوسفی ئەلبەیکەندی... چوە بەڵخ بۆ خزمەت مەککی کوڕی ئیبراهیم، ئینجا بۆ خزمەت عەففان لە بەغدادو، لەوێشەوە بۆ خزمەت المقرئ لە مەککەو، پاشان بۆ خزمەت ئەبو عاسم و ئەلئەنساری لە بەسرەو، ئیدی بۆ لای عوبەیداللەی کوڕی موسا لە کوفەو، ابو ئەلومغیرەو ئەلغەریانی لە شام، ئینجا بۆ خزمەت ئادەم لە عەسقەلان و ئەبو ئەلیمان لە حیمس و ئەبو سیهر لە دیمەشق... وە هەروەها...

ئیمام ئیبنوحوجەری عەسقەلانی، مامۆستاکانی ئیمام بوخاری پۆلێن کردون! کردونی بە پێنج پۆل، پاشان باسی هەر پۆلێکیان لە پێشەکی کتێبە بەنرخەکەی خۆیدا (فتح الباري) باس دەکات و، ناوی ناوە(هدي الساري). ئەمە پێگەیشتنی زانایانەو، ئەوەش مەلای ئیتتیحادول عولەمای عەمامە پیسی حکومەتان !! کە هەر هەمویان بە قەرەچەنەغەکانی پەرلەمانیشەوە کۆکەیتەوە، ناگەنە فەقێیەکی سەرەتایی بەردەستی ئیمام بوخاری، کە خۆشیان بە مامۆستای بوخاری دەزانن !!

## فەقێکانی ئیمام بوخاری

قوتابیان و فەقێکانی ئیمام بوخاری ئەوەندە زۆرن، لە ژمارە نایەن، بۆیە کەس خۆی هێندە ماندو نەکردوە بگەڕێت، تا هەر هەمویان ناونوس بکات! چونکە یەکێکی وەکو ئەلفەریری دەڵێ: نەوەد هەزار کەس کتێبەکەی ئیمام بوخارییان لە خۆیەوە وەرگرتوە !! (تاريخ بغداد٩/٢ ). جاری وا هەبوە بیست هەزار کەس، بۆ وەرگرتنی حەدیس لە دەرسێکیدا دانیشتون !! ئیتر کێ دەیتوانی خۆی بۆ ناونوسی ئەو هەمو خەڵکە تەرخان کات ؟!!

ئەوی، کە حەدیسی زۆری لێوە گێڕابێتەوە: ئیمام موسلیمە(موسلیمی کوڕی ئەلحەججاجی کوڕی موسلیم )، کە ئەویش هەر کتێبی سەحیحی نوسیوە،

منتدى إقرأ الثقافي

هەروەها ئیمام ترمزی(خاوەنی کتێبی(السُنَن)  ئەبوعیسا محمدی کوڕی عیسای کوڕی سورەو ئیمام ئەننەسائی خاوەنی(السنن) و ئەبو عبدالرحمن ئەحمەدی کوڕی شوعەیب و ئەبو حاتم و ئەبو زەرعەی رازی و ئەبو ئیسحاق ئیبراهیمی کوڕی ئیسحاقی حەربی الامام، و سالحی کوڕی محمد جەزرە و ئەبوبکری کوڕی خوزەیمەو یەحیای کوڕی محمدی کوڕی ساعید ومحمدی کوڕی عبداللەی مەتین.. هەر یەکێکیش لەم بەرێزانە بۆ خۆیان ئیمام ترن، چ لە زانستی حەدیس و گێڕانەوەی، چ لە ئەحکامی شەرعدا... کۆتا فەقێی ئیمام بوخاری، ئەلحوسەینی کوڕی ئیسماعیلی ئەلمەحامیلی بوە...

## تاقیکردنەوەی بوخاری لە بەغداد

ئیمام بوخاری لەسەرەتای لاوێتیدا ناوبانگی دەرکردبو، کە چو بۆ بەغدا، زانایانی حەدیس لێی کۆ بونەوەو وتیان تاقی دەکەینەوە، سەد حەدیسیان هێناو سەنەد و مەتنەکەیان (پشتاو پشت و دەقەکەیان) گۆڕی، هەمویان تێکەڵ و پێکەڵ کرد، ئینجا بەسەر دە زانادا بە تێکەڵاوی دابەشیان کردن، تا هەر یەکەیان بە جیا لە بوخاری بپرسێت، کات و شوێن دیاری کراو، خەڵکانێکی زۆری ناوچەکانی تری وەکو بەغداد و خۆراسانیش لەوێ بون، ئینجا یەکێ لە زاناکان دەربارەی یەکێك لەو حەدیسانەی لە لای بون لێی پرسی. بوخاری گوتی: حەدیسی وا بەو سەنەد و مەتنە نازانم، ئینجا یەکێکی تریان دەربارەی حەدیسێکی تر لێی پرسی، بەویشی گوت نازانم، ئینجا یەکێکی ترو حەدیسێکی تر، تا هەر سەد حەدیسەکەیان لێ پرسی، لە وەڵامی هەمویاندا هەر دەیگوت: نازانم. زاناکان سەیری یەکتریان دەکردو دەیانوت: وا دیارە کابرا هەستی پێ کردوە! هەندێکیشیان هەر دەیان وت: نازانێت، کە پرسیار دکانیان تەواو کرد، ئیمام بوخاری روی کردە یەکێکیان و گوتی: حەدیسی یەکەم، کە جەنابت لێت پرسیم، سەنەدەکەی لای فلان کەستانە،

منتدى إقرأ الثقافي

سەنەدی فلان حەدیسی جەنابیشت هی حەدیسی ژمارە ئەومندەی لای ئەویانە، ئاوا بەو شێوەیە هەر سەد دەقی حەدیسەکانی خستەوە سەر هەر سەد سەنەدەکان !! ئامادە بوان چاویان چوە پشتی سەریان و واقیان ورما. زانیان کە ئیمام بوخاری نەك هەر دەگمەنە، بەڵکو بێ وێنەیە.. ئەوجا دانیان بە زانایی و شارەزایی و بیرتیژییەکەی هێنا..

ئیمام ئیبنو حجر دەڵێ: سەیرەکەی هەر ئەوە نییە، کە هەمو سەنەد و مەتنەکانی گەیاندەوە بە یەك، بەڵکو لەوەشدایە، کە هەر لەو کۆڕەدا زانی سەنەدی کام حەدیس لەگەڵ مەتنی حەدیسی لای کامیانە !! ئەمەش هەر جێی سەرسوڕمانە، کە هەر لەو سات و ئانەشدا، هۆشی لەو هەمو گۆڕانکارییە بوە..

## کێشەکەی نەیسابورو حەسادەتەکەی الذُهلي

ساڵی ٢٥٠ ك ئیمام بوخاری ڕەحمەتی چو بۆ نەیسابور، ئیمام موسلیم دەڵێ: کە ئیمام بوخاری هات بۆ نەیسابور، ئەوەی بۆ ئەو کرا، بۆ هیچ والی، یان زانا، یان کەسایەتییەکی گەورەم نەدیوە بکرێت، هەر هەمو شار چو بون بەرەو پێشوازییەوە، ماوەی دو فەرسەخ بە قۆناغ خەڵکی ڕاوەستا بون بۆ پێشوازی[1].(هدي الساري لا ٤٩٠ ). پێش گەیشتنی ئیمام بوخاری، محمەدی کوڕی یەحیای دوهلی( الذهلي )، کە لە زانا بەناوبانگەکانی ئەوێ بو، بە خەڵکەکەی وت سبەینێ من دەچمە پێشوازی محمەدی کوڕی ئیسماعیل، هەر کەس لەگەڵ من دێت، با خۆی ئامادە بکات، بۆ سبەی، کە چونە سەر ڕێی دیتیان شار ڕژاوەتە سەر ڕێ! کە گەیشتە ناو شاریش، چوە دیوانی بوخارییەکان، ئیتر شەو

---

١ هەر فەرسەخێك سێ میل بوە، هەر میلێك چوار هەزار باڵ بوە، هەر باڵێك ٢٤ پەنجە بوە، ئەگەر هەر پەنجەیەك دو سانتیمەتری بۆ حسێب بکرێت، باڵێك دەکاتە ٤٨ سم، میلێکیش دەکاتە ١٩٢٠را مەتر، کەوابو یەك فەرسەخ دەکاتە٥٫٧٦٠ کلم. کەوابو ماوەی دە کیلۆمەتر خەڵکی بۆ پێشوازی ئیمام بوخاری ڕەحمەتی وەستابون !!

منتدى إقرأ الثقافي

ڕۆژ کۆڕی هەر جمەی دەهات، لەملاشەوە، کە دوهلی بە خەڵکەکەی وتبو بچنە دەرسی بوخاری، هەستی کرد وا فەقێکانی خۆشی ڕۆیشتون و، کۆڕی دەرسی خۆی چۆڵ بو، ئەمەش وردە وردە دەبوە مایەی حەسادەتی..

ئینجا حەسادەت و غیرەو بەغیلی، زانای تریشی توشی غەیبەت و دوزمانی کرد، تا ڕۆژێك فەقێی یەکێکیان چوە کۆڕی دەرسێکی ئیمام بوخاری و، لێی پرسی: ئەریٚ ئەبو عبدالله تۆ ڕات چییە لە مەسەلەی قورئان ؟! ئایا لەفزی قورئان دروست کراوە، یان نا ؟! ئیمام بوخاری وەڵامی نەدایەوە، بەڵام کابرا دوسێ جاری لەسەر یەك پرسییەوە، ئیدی ئیمام گوتی: قورئان فەرمایشتی خوای گەورەیە، دروست کراو نییە، کردەوەی مرۆڤەکان دروست کراوە، تاقیکردنەوەی خەڵکیش بەم پرسیارە بیدعەیە.. بەڵام کابرا کەوتە غەڵبە غەڵب و هاواری کرد: ئەوەتا محمدی کوڕی ئیسماعیلیش هەر دەڵێ: قورئان دروست کراوە!

ئیتر لەو ساتە بە دواوە فیتنەو ئاژاوە دروست بو، چونکە لەو زەمانەدا هەر کەس وای بوتایە، مانای وایە دژی ڕەئی خەلیفە مەئمو ڕەستایەوە، کە مەسەلەکە گەورەتر بو، کەوتە کۆڕی دەسەڵاتدارانی سیاسی و زانایانی حەسود، تا دوهلی(کە وەکو موفتی ڕەسمی دەوڵەت بو) بڕیارێکی دەرکرد و، وتی: قورئان فەرمایشتی خوایەو دروست کراو نییە، بەڵام هەر کەس بڵێت لەفزی قورئان دروست کراوە، ئەوە بیدعەچییەو نابێت کەس قسەو و ڕەفتاری لەگەڵدا بکات، لەبەر ئەوە بڕیارم دا، کە هەر کەسێك بچێتە کۆڕو دەرسی محمدی کوڕی ئسماعیلی بوخاری، تۆمەتباری کەن، هەر کەسێك بچێتە کۆڕو دەرسی ئەو، ئەوە ئەویش لەسەر ڕای ئەوەو، پێویستە قسەی لێ دابڕرێت !!

ئیمام ئەبو عبدالله ئەلحاکم دەڵێ: کە دوهلی ئەو بڕیارەیدا، ئیدی کەسانێك زۆر کەم نەبێت، کەس نەیوێرا بێتە دەرسی ئیمام بوخاری! مەگەر یەکێکی وەکو ئیمام موسلیم وئەحمەدی کوڕی سەلەمە !

منتدى إقرأ الثقافي

محمدی كوڕی نەعیم دەڵێ: ئەو زەمانەی ئەو كێشەیە بۆ ئیمام بوخاری پێش هات، چومە لای و دەربارەی پێناسەی باوەڕم لێ پرسی، گوتی: باوەڕ گوفتارو كردارەو زیادو كەم دەكات، قورئانیش فەرمایشتی خوای پەروەردگارەو دروست كراو نییە، باشترین یاوەری پێغەمبەریشﷺ ئەبو بەكری سددیقە، پاشان عومەر، پاشان عوسمان، پاشان عەلی كوڕی ئەبو تالیب. لەسەر ئەم بیروباوەڕە ژیاوم و لەسەر ئەمەش دەمرم و، ان شاء الله لەسەر ئەمەش زیندو دەكرێمەوە. (هدي الساري ل٤٩١). بۆیە تا لە ژیانی پیرۆزیدا مابو، هەر سور بو لەسەر دەربڕینی ئەو راو بۆچونەی، تەنانەت لە سەرە مەرگیشیدا، كە خەڵكی لە دەوری بون، ریشی پیرۆزی خۆی گرت و گوتی: (پشت بە خوای خۆم دەبەستم و كارەكان تەسلیم بەو دەكەم، خوا خۆی بینەرە، خوایە گیان، جەنابت دەزانی لە هاتنم بۆ نەیسابور، نە شانازی و، نەخۆبادانم ویستوە بەسەر كەسدا، نە پلەو پایەی ناو خەڵكیشم ویستوە، بەڵام كە نەمویست بچمەوە وڵاتەكەی خۆم، هەر لەبەر حەسادەتی خەڵكی بو، ئەوا لێرەش كەوتمە بەر شاڵاویی، خوایە گیان، جەنابت دەزانیت كە ئەو حەسادەتەی ئەو كابرایە پێم دەبات، هەر لەبەر ئەو خێرەی، كە جەنابت پێت بەخشیوم..(هدي الساري ل ٤٩١).

ئیمام ئەلحاكم لە ئەبو عبداللەی ئەلئەخرەمەوە دەگێڕێتەوە، كە گوتویەتی: ئیمام موسلیم و ئەحمەدی كوڕی سەلەمە، كۆڕو دەرسی دوهلییان بۆ كۆڕو دەرسی بوخاری واز لێ هێنا، پێی وتن: والله ناهێڵم كەسێك بچێتە كۆڕی ئەوەوەو بێتەوە كۆڕی من، ناشهێڵم من و ئەو لە شارێكدا نیشتەجێ بین !! كە هەواڵەكەیان دا بە ئیمام بوخاری، خۆی پێچایەوەو نەیسابوری بەرەو بوخارا بەجێ هێشت.

منتدى إقرأ الثقافي

## کێشەکەی ئەمیری بوخارا

کە ئیمام بوخاری نەیسابوری جێهێشت و بەرەو بوخارا گەڕایەوە، خەڵکی بوخارا زۆر دڵخۆش بون، لە زۆر چاوەڕوان کردنیاندا چادرو دەواریان لەسەر ڕێی هەڵدا بو !! کە گەیشتە جێ خەڵکەکە، پارەو شیرینییان بەسەردا هەڵ دەدا.. ئیتر بۆ ماوەیەك هەر لەوێ مایەوەو، لە مزگەوتێکی خۆیەوە دەرسی دەوتەوە.

جارێك والی بوخاری، خالیدی کوڕی ئەحمەد داوای لێ کرد، کە بچێتە ماڵی و دەرسی(مێژو) و(حەدیس) بە کوڕەکانی ئەو بڵێت، بەڵام ئەم وا وەڵامی دایەوە، کە من زانستی زەلیل ناکەم و نایبەمە لای کەس، ئەوی پێویستی بە زانستە، دەبێت خۆی بچێت بە شوێنیدا، جگە لەوەش من بۆ خۆشم زانست نابەمە دەرگای دەسەڵاتداران و، زانستیش مافێکی گشتییەو تایبەت ناکرێت بە کەسەوە. ئەوجا بە کابرای قاسیدی والیشی وت: ئەگەر ئەو پێویستی بە زانستی شەرعییە، با بێتە ئێرە بۆ مزگەوت بۆ لام، یان با بێتە ماڵەوە، ئەگەر جەنابی والی ئەمەشی پێ ناخۆشە، با فەرمانێك دەرکات و کۆڕو دەرسم لێ مەنع کات..تا بۆ منیش ببێتە بەهانەو هەنجەتی قیامەتم. چونکە من زانست ناشارمەوەو هەر دەیڵێمەوە، ئیدی ئەمە بوە سەرەتای زویر بون و ناخۆشی نێوان ئەو والی بوخاری. ئینجا خالیدی والی، کابرایەکی بۆ دەردەسەری کردە بەرپرس، کە ناوی ئەلحەربی کوڕی ئەبولوەرقاو بو، زۆر بێ ئینسافانە کەوتنە زمان لێدان و تۆمەتبار کردنی بە تاوان و فیتنەی وەکو، دروست کردنی قورئان و بەرهەڵستی کردنی دەسەڵاتی سیاسی !! تا گەیشتە ئەوەی والی، فەرمانی نەفی کردنی ئیمام بوخاری دەرکرد..

کە ئیمام بوخاری گەێنرایە قەراغ شار بۆ دەرکردنی، ڕوی کردە ئاسمان و ئاوا پاڕایەوە: خوایە گیان، ئەو شتەی نیشان دەرەوە، کە لە کێشەی مندا مەبەستیان بو، خوایە لە خۆیان و ماڵ و منداڵیان دەرهێنەرەوە)... مانگێکی نەبرد خالیدی والی فەرمانی دەرکردن و،زەلیل کردنی بۆ دەرچو، نەك هەر لە

منتدى إقرأ الثقافي

والیێتی لایان برد، بەڵکوسواری ماکەرێکیشیان کردو بە شاردا بە چاوشۆڕی گێڕایان!ئەلحەربیش خۆی و ماڵ و منداڵی توشی بەڵاو موسیبەتێکی وا بو، کە هەر باس ناکرێت !!(هدي الساري لا ٤٩٣).

## کۆچی دوایی کردنی

ئیمام بوخاری چوە لای خزمەکانی لە گوندی خەرتەنگی لای سەمەرقەند(لە ئۆزبەگستانەو، ئێستا بە خەرتەنگ دەڵێن خواجا ئاباد) لەوێ بۆ ماوەیەکی کەم مایەوە، نەخۆش کەوت، بۆیە خەڵکی سەمەرقەند بە تکاو رجاوە ناردیان بە شوێنیدا، کە تەشریف بهێنێتە شارەکەی ئەوان، ئەویش ڕازی بو، ئەسپێکیان بۆ زین کرد و عەمامەکەی لەسەر کردو خوففەکانی لە پێ کرد، کە نزیکی بیست سی هەنگاوێك بەرەو ئەسپەکە رۆیشت، تا سواری بێت، بەڵام هەستی بە داهێزران و نەساغی کرد، گوتی: لێ گەڕێن با دانیشم، با راکشێم، کە راکشا کەوتە پاڕانەوەو دوعا کردن، ئەوەندەی ئارەق کردەوە، کە خەڵکی سەریان سوڕما، ساتە وەختێکی کەمی نەبرد گیانی سپارد، بەڵام تا خستیشیانە ناو کفنەکەیەوە، هەر ئارەقی دەردەدا !!

ئەوانەی نزیکی بون، گێڕایانەوە، کە ئەو شەوەی بۆ سبەی بەتەما بو بچێت بۆ سەمەرقەند، زۆری ئەم دوعایە دوبارە دەکردەوە: (اللهُمَّ قَدْ ضَاقَتْ بِيَ الارضُ بِمَا رَحُبَتْ، فَاقْبِضْنِي اليكَ) واتە: خوایە ئەم سەرزەمینە بەرفراوانەم لێ تەسك بۆتەوە، خوایە بمبەرەوە بۆ خزمەت خۆت !!

ئاوا ـ هەزاران ﷺ لە شەوی شەممە، دوای نوێژی عیشا، کە شەوی جەژنی رەمەزانی ساڵی ٢٥٦ ی کۆچی بو، گیانی پاکی بەرەو عەرشی خوای پەروەردگار بەرز بۆوە و، لە تەمەنی ٦٢ ساڵیدا کۆچی دوایی کرد.. ﷺ..

منتدى إقرأ الثقافي

## بەرهەمەكانی

قەستەلانی رەحمەتی لە(مقدمة) كەیدا دەڵێ: ئەمما كتێبەكانی، ئەوەندە زۆرو بە نرخ و بە ناوبانگ دەرچون، گەیشتونەتە ئەو كات و شوێنەی هەتاوی گەیشتۆتێ، یان دەیگاتێ و ئەو كات و شوێنەش، كە دەورانی زەمانەی بەسەردا دێت! كەسیش ناتوانێت نكوڵی لە فەزڵ و گەورەیی ئەم زاتە پاكە بكات، مەگەر ئەو كەسەی شەیتان گەمە بە ئاقڵی كردبێت، ئەمانەی خوارەوە لە بەناوبانگترین كتێبی ئیمام بوخارین:

١. الجامع الصحيح. ٢. الادب المفرد ٣. رفع اليدين في الصلاة. ٤. القراءة خلف الامام. ٥. بر الوالدين. ٦. التاريخ الكبير.

٧. التاريخ الاوسط. ٨ . التاريخ الصغير. ٩. خلق افعال العباد ١٠. الضعفاء. ١١. المسند الكبير.١٢. التفسير الكبير.

١٣. الاشربة. ١٤. الهبة. ١٥. أسامي الصحابة. ١٦. الوحدان.١٧.المبسوط.١٨.العلل.

١٩. الكنى.٢٠. الفوائد.٢١. قضايا الصحابة

منتدى إقرأ الثقافي

## سەحیحی بوخاری لە چەند دێڕێکدا:

- ناوی کتێبەکە: (الجَامِعُ المُسنَدُ الصَّحيحُ المختصَرُ من أمور رسولِ الله – صلى الله عليه وسلم – وسُنَنِهِ وأيَّامِهِ)، بەڵام هەر بە سەحیحی بوخاری بەناوبانگە.

- پلەی: زانایان گوتویانە: سەحیحی بوخاری، یەکەمین کتێبی حەدیسی سەحیحە، کە تایبەت بە حەدیس نوسرابێت. (علوم الحديث/ ابن الصلاح لا ١٤). هەروەها لەسەر ئەوە کۆکن، کە راستترین کتێب نوسرا بێت، سەحیحی بوخاری و سەحیحی موسلیمن. گوتوشیانە، کە سەحیحەکەی بوخاری لەوەی موسلیم راستتر و بەسودترە. ئیمام ئیبنو تەیمییە دەڵێ: لە ژێر شینایی ئەم ئاسمانەدا، دوای قورئانی پیرۆز ـ کتێبێکی تری ڕاست وەك سەحیحی بوخاری و موسلیم نییە.(مجموع الفتاوى / ٧٤/١٨) ئیمام نەسائیش دەربارەی دەیگوت: لەم کتێبانەدا لە سەحیحی بوخاری چاکتری تێدا نییە.

- هۆی دانانی کتێبەکەی: ئیمام بوخاری دەڵێ: لە خزمەتی ئیسحاقی کوڕی راهەوەیدا دانیشتبوم، گوتی: خۆزگە یەکێکتان کورتەیەکی حەدیسی سەحیحی پێغەمبەریﷺ بۆ کۆدەکردینەوە، منیش هەر ئەو ساتە ئەوە لە دڵم چەسپی، کە بکەومە کۆکردنەوەی حەدیسی سەحیح..

- ماوەی دانانی کتێبەکە: ئیمام بوخاری دەڵێ: ئەو کتێبی (سەحیح)ەم بە شازدە ساڵ داناوە، لە کۆی ٦٠٠،٠٠٠ شەش سەد هەزار حەدیس هەڵم بژاردوە، کە ئیدی کردومەتە هەنجەتی نێوان خۆم و خوای گەورە... ئەوی سەحیحیش نەبو بێت تۆمارم نەکردوە، زۆر حەدیسی سەحیحیش هەیە، هەر لێی گەڕاوم و تۆمارم نەکردوە، وتومە نەبادا کتێبەکە زۆر ئەستور ببێت. ئەلفاریەری(کە فەقێی ئیمام بوخارییە) دەفەرموێ: ئیمام دەڵێ: هیچ حەدیسێکم لەم کتێبەمدا تۆمار نەکردوە تا غوسڵێکم دەرنەکرد، بێت و، دو رکات نوێژم نەکردبێت.

منتدى إقرأ الثقافي

ـ شوێنی دانانی كتێبەكە: ئیمام بوخاری دەڵێ: پێنج ساڵ لە بەسرە مامەوە كتێبەكانیشم پێ بو، هەر ساڵەو حەجێكم دەكرد، ئینجا لە مەككەوە دەگەڕامەوە بۆ بەسرە، بۆیە ئومێدەوارم خوای گەورە، بە لوتفی خۆی بەرەكەتی خۆی بۆ موسوڵمانان بخاتە كتێبەكانمەوەو بە سودیان كات..(تأريخ بغداد ٩/٢). مەبەستی لەوەیە، كە چۆتە مەككەو لەوێ حەدیسەكانی دوای هەر غوسڵ و دو ركات نوێژ تۆمار كردوە! بۆیە لە جێیەكی تردا دەڵێ: كتێبی الجامعەكەم(سەحیحەكەی) لە مزگەوتی حەرام(لە كەعبە) نوسیوەتەوە، هیچ حەدیسێكیشم تۆمار نەكردوە، تا لە راستییەكەی دڵنیا نەبوبم و، تا دو ركات نوێژم نەكردبێت و، دوعای ئیستیخارەم بۆ نەكردبێت...

زانایان لەسەر ئەو رایەن، كە ئیمام بوخاری، ماوەی شازدە ساڵ حەدیسی كۆكردەوەو لەبەری كردن، بەڵام بۆ تۆمار كردنیان، ئاوا چۆتە حەرەمی كەعبە، بەو هیوایەی ـ وەكو خۆی گوتویەتی ـ خوای گەورە زیاتر بەفەڕی كات..

جا سەیری ئەم لەخوا ترسان و خۆتەسلیم كردنە بە قەدەری خواو، دیقەت لەم حەوسەڵەو سەبرە بگرەو، بزانە چ پارەكی سەرف كردوە لەم هەمو رێ و بان و هاتوچۆیەیدا.. سەیری ئەم تەسلیم كردنە بە خوای خاوەن دەسەڵات ؟! بۆ تۆمار كردنی هەر حەدیسێك غوسڵێك و و دو ركات نوێژ ؟! بۆ تۆمار كردنەكەش لە هەر كوێیەك بو بێت، هاتۆتەوە كەعبەی پیرۆزو لەوێ تۆماری كردوە !! ئێستاش هەزاران مەلا هەیە كتێبەكەی نەدیوەو ئیمامشە !! یان ئەفەندی وا هەیە لە ئەزهەر، حەدیسێكی بوخاری توێژیوەتەوەو، دكتۆرای لەسەر وەرگرتوەو بوە بە پرۆفیسۆری زانكۆی ئیسلامی !!

منتدى إقرأ الثقافي

## ناوەڕۆکی سەحیحی بوخاری

کتێبی سەحیحی بوخاری بە لای ئەهلی سوننەت و جەماعەتەوە، راسترین کتێبە، کە مرۆڤ نوسیبێتی، گرنگترین‌و سەرەکیترین مەرجەعی حەدیسە، بۆیە پێویستە هەمو موسوڵمانێك، زانیارییەکی گشتی دەربارەی بزانێت..

شێخ تەقیوددینی کوڕی سەلاح، کە بە(ئیبنوسسەلاح بەناوبانگە) دەڵێ: ژمارەی حەدیسەکانی بوخاری، بەوانەشەوە، کە دوبارە بونەتەوە(٧٢٧٥ حەوت هەزارو دو سەدو حەفتاو پێنج) حەدیسە، بێ ئەوانەی، کە دوبارە بونەتەوە(٤٠٠٠ چوار هەزار) حەدیسە.. ئیمام نەوەویش لە موختەسەرەکەیدا هەر وای گوتوە.[1] بەڵام حافز ئیبنو حەجەری عەسقەلانی لە پێشەکی فتح الباریدا، کەراڤەی بوخارییە دەڵێ: (دەقی حەدیسە ئەسڵەکان بێ دوبارە کردنەوەیان(٢٦٠٢ دو هەزارو شەش سەدو دو) حەدیسە، ئەوانەی، کە هەڵپەسێرراون و مەرفوعن - کە پێیان دەوترێت معلق[2] - ١٥٩ سەدو پەنجاو نۆ) حەدیسن... بە هەردو کۆمەڵەکە دەبنە(٢٧٦١ دو هەزارو حەوت سەدو شەست و یەك) حەدیس[3]...

بەڵام بە هەمو ئەوەی، کە لەو کتێبەیدا گێڕاوێتیەوە، ئەوەی، کە سەحیحە، یان ئەوەی، کە موعەللەقە، یان مەرفوعە(٩٠٨٢ نۆ هەزارو هەشتاو دو) حەدیسە، ئەمە جگە لەوانەی، کە گەیاندویێتییە سەر قسەی یاوەران، یان تابعین و تێیدا وەستاوە...

---

١ بروانە: السيوطي: تدريب الراوي ب١ / ١٠٢..

٢ ئەوانەن کە ئیمام بوخاری لە ناونیشانی هەندێك بابی کتێبەکەیدا نوسیبونی بەو هیوایەی خۆی زیاتر لێیان بکۆڵێتەوە، بەڵام کۆچی دوایی کردو ئەو کارەی بۆ ئەنجام نەدرا..

٣ هدي الساري لا ٤٦٥.

منتدى إقرأ الثقافي

## مەرجەکانی ئیمام بوخاری

ئیمام بوخاری لە کتێبەکانیدا، مەرجەکانی خۆی بۆ کۆکردنەوەی حەدیس تۆمار نەکردوە، بەڵام فەرمودەوانان ئەوەیان هەر لە بەرنامەو دەستوری ئیمام بوخاری خۆیەوە وەرگرتوەو نوسیویانەتەوە، جگە لەوەی خودی ناوی کتێبەکەی خۆی ڕێسایەکە، کە ناوی ناوە(الجامعُ الصحيحُ المُسنَدُ المختصَرُ من أمورِ رسولِ الله وسُنَنِهِ وأيّامِهِ ). چونکە:

ـ الجامع: واتە کۆکراوەی ئەحکام و چاکەکان(الفضائل) و ئاداب و، سیفەتەکانی خواویستی، کە پێیان دەوترێت:(الرقائق ).

ـ الصحيح: واتە تەنها ئەوانەی تێدایە کە حوکمی سەحیحی داون.

ـ المسند: واتە تەنها ئەو حەدیسانەی تێدا نوسیون، کە سەنەدەکانیان بێ پسان گەیشتۆتەوە بە پێغەمبەرﷺ و، سوننەتێکی جەنابیان باس دەکەن: چ فەرمایشتێکی بێت، یان کردارێکی، یان بڕیاردانێکی، یان سیفەتێکی جەسەیی، یان سیفەتێکی ڕەوشتی بێت.

لەم پێناسەوەیە، کە زانایان گوتویانە: بوخاری دو مەرجی بۆ حەدیس داناوە: یەکەمیان هاوچەرخی، دوەمیان دیدارو دیتن. بەڵام ئیمام موسلیم هەر هاوچەرخییەکەی بە مەرج داناوە.

## سەحیحی بوخاری هەمو حەدیسێکی تێدا نییە

بێگومان سەحیحەکەی ئیمام بوخاری، هەمو حەدیسێکی پێغەمبەریﷺ لە خۆ نەگرتوەو خۆشی وای نەوتوە، چونکە خۆی، کە گوتویەتی، سەد هەزار حەدیسی سەحیح و دوسەد هەزار حەدیسی غەیرە سەحیحم لەبەرە. ئەوەی لەسەرەوەش باسمان کرد بە هەمو ڕاجوێیی زانایانیشەوە، ناگاتە دەیەکی ئەو

منتدى إقرأ الثقافي

حەدیسە سەحیحانەی لەبەری بون.. بە تایبەتی کە ئەوە دەزانین: ئیمام بوخاری هەر حەدیسێك، هەردو مەرجەکەی خۆی بەسەردا نەچەسپی بێت، تۆماری نەدەکرد، هەروەها خۆشی دەڵێ: هەر ئەوەندەم حەدیس تۆمار کرد، حەدیسی تری دورو درێژ زۆر بو، کە لەبەر قەبارەی کتێبەکە تۆمارم نەکردون..

## مەرجەکانی سەحیحی بوخاری

ئەگەر ئەوە لەبەرچاو بگرین، کە لە زەمانی ئیمام بوخاری خۆیدا، نەوەد هەزار کەس حەدیسی لێ وەرگرتوەو، جاری وا هەبوە بیست هەزار کەس لە یەك دەرسیدا دانیشتوە! ئەوەمان بۆ دەردەکەوێت، کە حەتمەن زانایان بایەخێکی زۆریان بە مەرج و شێوازی کۆکردنەوەو کتێبەکانی داوە، بە تایبەتی سەحیحەکەی، بۆیە دەیان بگرە سەدان کتێب دەبینین، کە هەیانە لەسەر ئەحکامەکانی حەدیسی بوخاری نوسراون، هەیانە لەسەر پیاوانی سەنەدەکانیان، یان لەسەر حەدیسە موعەللەقەکانی، یان لەسەر راڤە کردنی وشە گرانەکانی، یان مەسەلەکانی ئیعراب و رێزمانەوانی.. تەنانەت هەر حاجی خەلیفەی خاوەن کتێبی(کشف الظنون) دەڵێ، لە هەشتا شەرحیم زیاتر دیوە، ئەمە جگە لەو کتێبانەی لە دوای زەمانی ئەو نوسراون، کە لە هەندێك سەرچاوەدا هاتوە، کە تەنها شەرحی سەحیحەکەی ١٣١ سەدو سی و یەك شەرحە[١]، دیسان ئەمەش جگە لە دەیان نامەی ماستەرو دکتۆرا هەیە، کە لەسەر ئیمام بوخاری و سەحیحەکەی نوسراون!

---

١ ابو عبیدة : تراجم أصحاب الکتب الستة ـ بڵاوکراوەی بەشی مەعنەوی لە سەرکردایەتی گشتی سوپای دەوڵەتی ئیماراتی عەرەبی/ چاپخانەی سەربازی چاپی یەکەم ١٩٩١.

منتدى إقرأ الثقافي

## هەندێك شەرحی بەناوبانگی سەحیحی بوخاری

١ـ فتح الباري بشرح صحيح البخاري / شيخ الاسلام امام الحفاظ احمد بن علي بن محمد بن محمد بن علي بن محمود بن احمد بن احمد الكناني العسقلاني المصري الشافعي[١]: ئەمەیان بە ناوبانگترین و گرنگترین شەرحە، لــە هــەموان زیــاتر بەســودترە، شــەرحەکەی ١٣ ســێزدە بەرگــەو، پێــشەکییەکەشی بــەرگێکی گەورەیــەو لەســەر رێــساو زانیارییــەکانی فەرمودە(علوم الحدیث)ە ، ئیمام ئیبنو حەجەر خۆی ناوی ناوە(هدي الساري لمقدمة فتح الباري). ئیمام ئیبنو حەجەر دەفەرموێ: ڕاڤە کردنی حەدیسەکانی سەحیحی بوخاری، ماوەی بیست و پێنج ساڵی ویست، لە ساڵی ٨١٧ ەوە خەریکی بوم تا ساڵی ٨٤٢ !! بۆیە، کە لە شەرحەکەی بوەوە، دەعوەتێکی زۆر گەورەی بۆ هەمو خەڵکی کرد، دەڵێن کەس نەمابو لەو شارە بانگ نەکرا بێت!

٢ـ عمدة القاري في شرح البخاري / الشيخ العلامة بدرالدين محمود بن احمد العيني الحنفي، ئەمیش ماوەی دە ساڵی پێچو، تا لە شەرحەکەی بوەوە.. حاجی خەلیفە خاوەنی(کشف الظنون) دەڵێ: لە زۆر شوێندا بدرالدین العینی لە شەرحەکەی ئیبنو حەجەری وەرگرتوە، جاری وا هەیە بە لاپەڕە لێی وەرگرتوە، چ بە ڕاستەوخۆ، چ بە لاوەکی لە ڕێی البرهانی کوڕی الخضرەوە لە کتێبی(المصنف)ەکەیەوە. . .

٣ـ ارشاد الساري الى شرح صحيح البخاري / الشيخ شهاب الدين احمد بن محمد الخطيب القسطلاني القاهري الشافعي، لە ڕاستیدا ئەمیان پوختەیەکی

---

١ لە ١٣ شەعبانی ٧٧٣ ی کۆچیدا لە میسر لەدایك بومو لە ١٨ ی ذي الحجة ی ٨٥٢ ك کۆچی دوایی کردومو لە قاهیرە نێژراوە..

منتدى إقرأ الثقافي

ئەو دو شەرحەی پێشوە(الفتح و العمدة) هەر بە ناوی نوسەرەکەیەوە زیاتر بەناوبانگ بوە، هەر دەوترێت: شەرحی قەستەلانی..

٤ـ الكواكب المدراري في شرح صحيح البخاري / العلامة شمس الدين محمد بن يوسف بن علي بن سعيد الكرماني، کە هەر بە شەرحی کرمانی بەناوبانگە، ئەمیش زۆری لە راڤەکانی فەتح و عومدە وەرگرتوە. جگە لەوەی ئیعتیمادی زۆری کردۆتە سەر سێ شەرحی تر: شرح الخطابي الشافعي[1]، شرح ابن بطال المالكي[2]، شرح مغلطاي الحنفر[3]، کرمانی ساڵی ٧٨٦ ك کۆچی دوایی کردوە..

٥ـ شەرحی ئیمام نەوەوی(الامام ابن زكريا محيي الدين النوي الشافعي)، کە ساڵی ٦٧٦ ك کۆچی دوایی کردوە، تا کۆتایی(كتاب الايمان) ی لێ شەرح کردوە، چونکە پێش تەواو کردنی هەمو شەرحەکەی، کۆچی دوایی کردوە، رەحمەتی خوای لێ بێت..

٦ـ شەرحی ئیمام ئەبو سولەیمان الخطابي(بڕوانە پەراوێزی ژمارە ٦ لە خوارەوە )، کە ناوی ناوە(اعلام السنن ). یەك بەرگە..

٧ ـ شەرحی ئیمام ئەبول حەسەن عەلی کوڕی خەلەف، کە بە ابن بطال المغربي المالكي بەناوبانگە(پەراوێزی خوارەوە ژمارە ٧ ).

٨ ـ شەرحی ئیمام ناصرالدين عەلی کوڕی محمد المنير، کە دە بەرگە.

---

١ ناوی محمدی کوڕی محمدی ئەلبوستی یە، شەرعناس و فەرمودەوانێکی بەناوبانگە، خەڵکی شاری(بوست)ە، ساڵی ٣١٩ ك لەدایك بوە لە کتێبەکانی(معالم السنن) و(شرح البخاری )، ساڵی ٣٨٨ ك کۆچی دوایی کردوە..

٢ ناوی عەلی کوڕی خەلەفی کوڕی عبدالملكی کوڕی بطالە، زانایەکی گەورەی حەدیسە، خەڵکی قورتوبە بوە، ساڵی ٤٤٩ ك کۆچی دوایی کردوە..

٣ ناوی موغەڵتای کوڕی قولەیبیجە، ساڵی ٦٩٨ ك لەدایبودو ساڵی ٧٦٢ ك کۆچی دوایی کردوە.. زانایەکی گەورەی حەدیس و مێژونوس و شارەزای زانستی نەسەب زانییە، نەسڵی تورکەو، کتێبی زۆری نوسیوە.

منتدى إقرأ الثقافي

٩ ـ شەرحی ئیبنوتتین(الامام عبدالواحد بن التین) لە سەدەی نۆیەمدا یەکێك بوە، لە کتێبە بەربلاوەکان، بۆیە ئیمام ئیبنو حەجەریش بۆ(فتح الباری) ەکەی خۆی، لێوەی وەرگرتوە..

١٠ ـ شەرحی تەلویح(التلویح / للامام علاء الدین مغلطاي بن قلیبح المصري الحنفي )، کە ساڵی ٩٧٢ ك کۆچی دوایی کردوە.. کتێبێکی گەورەیە.

١١ ـ شەرحی سیوتی(الحافظ جلال الدین السیوطي )، کە ساڵی ٩١١ ك کۆچی دوایی کردوە، راڤەیەکی جوان و ئاسانە، نوسەر ناوی ناوە(التوشیح علی الجامع الصحیح )، عەللامە السید عەلی کوڕی سولەیمانی مالیکی دەمەنتی کورتی کردۆتەوەو، ناوی ناوە(روح التوشیح ).

١٢ ـ شەرحی شێخی نەدوی: شێخ ئەبول حەسەن النەدوی موفتی ساڵی ١١٣٨ ك کۆچی دوایی کردوە.

١٣ ـ التجرید الصحیح لاحادیث الجامع الصحیح/ الشیخ الامام زین الدین ابو العباس احمد بن احمد بن عبداللطیف الشرجي الزبیدي، کە ساڵی ٨٩٣ ك کۆچی دوایی کردوە، ئەم ئەو حەدیسانەی لابردوە، کە دوبارە بونەتەوە، هەروەها معلەقەکان وناوی بابەکانیش، هەر ناوی (کتاب) ەکانی هێشتۆتەوە..

١٤ ـ تیسیر القارئ/ الشیخ العلامة نور الحقّ الدهلوي،(بە فارسییە) کە ساڵی ١٠٧٣ ك کۆچی دوایی کردوە.

١٥ ـ ئەو پەراوێزانەی زانای گەورە ئەحمەد عەلی سەهارەنفوری نوسیونی، کە ساڵی ١٢٩٧ ك کۆچی دوایی کردوە..

١٦ ـ فیض الباري: دەرس وتنەوەکانی زانای فەرمودەوان، السید محمد ئەنوەری کەشمیرییە، کە ساڵی ١٣٥٢ ك کۆچی دوایی کردوە.

منتدى إقرأ الثقافي

١٧ ـ لامع الـدراري على جـامع البخـاري / المحـدث الكـبير محمـد زكريـا الكاندهلوي السهارنفوري..

١٨ ـ شەرحەکەی مامۆستا مەلا عوسمانی کوڕی عبدالعزیز ـ رحمه الله ـ به کوردی، کە بە داخەوە تەواوی نەکردوە.

ئەمـه بەشـێك بـو لـه مێـژوی پـڕ سـەروەریی پێـشەوای فـەرمودەوانان و، زانایانی شەرعناسی ئوممەتی موسوڵمان، ئیمام بوخاری رەحمەتی خوای لێ بێت.. کاتێك موسوڵمان دەزانێت، کە لە مێژوی ئەم ئوممەتـەدا، ژیانی نیو ملیۆن و سێزدە هەزار زانای ئاوا نوسراوەتەوە ئینجا دەزانێت چۆن ئـەم دینـە بـەو پـاکی و بڵندیـەوە مـاوە، کـە مێـژوی ژیـانی ئـەو کەڵەپیاوانـەی ئیـسلام دەزانێت، ئینجا بۆی دەردەکەوێت، کە بـە هـۆی ئـەم کۆڵەکانـەوە، بـوە کـە ئـەم ئوممەتە موسوڵمانە توانیویتی بـۆ مـاوەی هـەزار ساڵ، نیـوەی سـەرزەمین بـەم شەریعەتە پاکەیەوە حوکم کات، ئێستاش، کە ئیـسلامیان، هـەوڵی جیـددیان لـە کاردایە بۆ هێنانەوەی سایەی ئەو حوکمە شکۆمەندە، دوژمنان زیاتر هەست بە دژواری بانگەوازەکـەیان دەکـەن لەسـەر بەرژەوەنـدی دزی و گزییـان، بۆیـە بـە هـەمو توانایـەکی نێـو دەوڵەتیـەوە، رێ لـە هاتنـەوەی ئیـسلام(وەکـو عەقیـدەو عیبادەت و شەریعەت) پاشان(وەکو ئوممـەت و بانگـەواز و خیلافـەت) دەگـرن.. بۆیە ئەرکی سەرشانی موسوڵمانانە، کە زیاتر لـە دینەکە تێبگەنـەوەو ئیقتیـدا بە پشودرێژیی ئەو زانا بەرزانەیان بکەنەوەو، لەسەر رەویەی موبـارەکی ئـەوان بڕۆن، تا خوای میهرەبانیش بە لوتفی خۆی لـەم قۆنـاغی ئیـستیزعافە دەرمـان کات، و بەرەو قۆناغەکانی تەمکینمان ببات...

منتدى إقرأ الثقافي

# ئیمام موسلیم( ﷺ )

(٢٠٤ ـ ٢٥٩ ك)

## ناو رەچەڵی

ئیمـام موسـلیم، حـافزی[١] گـەورەو حوججـەتی ئیـسلام: ئـەبول حوسـەین موسـلیمی کـوڕی ئەلحـەججاجی کـوڕی موسـلیمی کـوڕی کەرشـان ئەلقوشـەیری ئەننەیسابوری.. لە هۆزی بەنی قوشەیرە، کە عەرەبن، بەڵام خۆی لە نەیسابور نیـشتەجێ بـوە، کـە ئێـستا بـە نیـشابور دەناسـرێت لـە ئۆزبەگـستان.. ئەمـە نەیـشابوری ئێـران نیـە، کـە نزیکـی مەشـهەدە.. کـەوابو ئیمـام موسـلیم ئەسـڵی عەرەبە..

## لە دایكبون و گەشەی

كۆڕای نوسەرانی سیرەو مێژونوسـان لەسـەر ئـەوەن، کـە ئیمـام موسـلیم لـە دوای ساڵی ٢٠٠ی كۆچی لەدایكبوە، بەڵام لە ساڵەکەیدا رایان جیـاوازە، هەنـدێك وەكو لە كتێبەكانی (تهذیب التهذیب ١٢٧/١٠) و(تذكرة الحفاظ ٥٨٨/٢) دا هـاتوە،

---

١ مەبەست لەوە نیە كە چاوی كوێر بوبێت، وەكو ئێستا لـە كوردەواریـدا یـەكێك كوێر بێت، پێی دەڵێن حافز!! چونكە بە داخەوە لە ناو كوردا هەر ئەو كەسانەی چاویان كوێر بـوە قورئانیـان لەبـەر كـردوە!! بۆیـە وای لـێ هـاتوە، كـە حـافز یـەعنی كـوێرو، كـوێریش یـەعنی حـافز !! لـە فەرمودەوانیـدا بـە زانایـەك وتـراوە حـافز، كـە چـەندین هـەزار حەدیـسی لەبـەر بوبێت، زانایـان هەندێكیان فەرمویانە لانی كەم دەبێت دە هەزار حەدیسی بە سەنەدو دەق زانینەوە(درایە وروایە) لەبەر بێت، ئینجا پێی دەوترێت حافز، هەنـدێكی تـر گوتویانـە دەبێت سێ سـەد هـەزار حەدیـسی لەبەر بێت ئینجا شایانی ئەوەی پێی بوترێت حـافز !!!(تـذكرة الحفـاظ وتبـصرة الایقـاظ/ نوسـینی یوسف عبدالهادي ٩٠٩ ك )..

منتدى إقرأ الثقافي

دەڵێن ساڵی ٢٠٤ ی كۆچیە(٨١٩ زاینی) لەدایكبوە، بەڵام هەندێكی تریان وەكو ئیبنو خەلەكان لە كتێبی(وفیات الاعیان ١٩٥/٥) ەكەیدا دەڵێ: ساڵی ٢٠٦ك / ٨٢١ ز) لەدایكبوە.. راستتریان (واللە اعلم) ئەمەی ئیبنو خەلەكانە، چونكە ئیبنو سەلاحی گەورەش، كە لە كتێبی(علماء الامصار) ی ئیمام ئەلحاكم ئەبو عبداللە كوڕی ئەلبەیعی حافزی نیسابورەوە نەقڵ دەكات، كە باسی ئیمام موسلیم دەكات دەڵێ: حاكم نزیكی زەمانی ئیمام موسلیم بو..(ئەلحاكم لە ٣٢١ ـ ٤٠٥ ك) دا ژیاوە..

ئیمام حافزی زەهەبی دەڵێ: بۆ یەكەمین جار، كە موسلیم گوێی لە حەدیس گرت، ساڵی ٢١٨ ك بو..(تذكرة الحفاظ ٥٨٨/٢ )... كەوابو ئیمام موسلیم لە تەمەنی دوازدە ساڵیدا كەوتۆتە لەبەر كردنی حەدیس... ئاشكراشە، كە پێشتر قورئانی لەبەر كردوە، چونكە عادەتی هەمو میللەتی ئیسلام، لە هەمو شوێنێك وابو، كە یەكەمین دەست پێكردنی قوتابی، دەبو قورئانی پیرۆز لەبەر بكات..

## زانستی و كاسبی

باوكی ئیمام موسلیم پیاوماقوڵێكی دیندار بو، خاوەن سامان و دیوەخان بو(تهذیب التهذیب ١٢٧/١٠). ئیمام موسلیمیش لە ناز و نیعمەت و لە ژێر سەرپەرشتیارێتیەكی بەرپرسانەدا گەورە دەبو، بۆیە هەر لە سەرەتاوە نرایە بەر خوێندن و مامۆستای بۆ دەگیرا.. لەگەڵ ئەوەشدا باوكی رەحمەتیی، فێری ئەوەی كردبو، كە لەشی بۆ كاسبی رام بێنێت، بۆیە كردبوشی بە شاگردی بازرگانی كوتاڵ فرۆشی تا بوە بەززاز(تهذیب التهذیب ١٢٧/١٠). دواتریش بوە یەكێك لە فرۆشیارانی كوتاڵ و پۆشاك بە جوملە، تا بۆتە یەكێك لە دەوڵەمەندەكانی نیسابور(شذرات الذهب ١٤٥/٢) ..

منتدى إقرأ الثقافي

کەوابو ئیمام موسلیم سەرەتای ژیانی بە زانست و سامان و پیاوماقوڵی دەست پێکردوە، ئاسان رێی ئەوەی بۆ کراوەتەوە، کە بۆ زانست وەرگرتن خۆی ساغ کاتەوەو، لە مەسروفاتی خوێندنی وەکو کتێب کڕین و سەفەری لای زانایان، لە شاری جیاوازو دور، بێ خەم بێت...

## سیماو هەیئەتی

ئیمام موسلیم بالآبەرز بوە، سپی پێست و ریشی پڕ بوە، لکێکی عەمامەکەی هەمیشە بە نێوانی شانەکانیدا شۆڕ دەکردەوە...

## سەردەم و ولآتی

ئیمام موسلیم لە چەرخی سێیەمی کۆچیدا ژیا، کە یەکێکە لە چاکترین چەرخی زێڕینی ئیسلامەتی، سەردەمێکە، کە پێغەمبەری نازدارﷺ وەکو عیمرانی کوڕی حەسین دەگێڕێتەوە دەربارەی فەرمویەتی: (خيرُ الناسِ قَرْنِي، ثُمَّ الذينَ يَلُونَهُمْ، ثُمَّ الذينَ يَلُونَهُمْ) بوخاری ٥/١٩٠، موسلیم ٢٥٣٥. واتە: باشترین کەس ئەوانەی سەردەمی منن، پاشان ئەوانەی دوای ئەوان دێن، ئینجا ئەوانەی تر، کە لەدوای ئەوان دێت.. ئەو چەرخە سەردەمی گەشانەوەی زانستی شەرعی بو، زانیاریە ئیسلامیەکانیانی تێدا تۆمار دەکرا، ڕێسایان بۆ دادەڕێژرا، سەدان کەڵەپیاوی ئەم ئیسلامەی تێدا هاتە بەرهەم و، زانای گەورەو بەناوبانگ، بونە ئەستێرەی ڕێنیشاندانی ئوممەت.. چونکە سیستمی خیلافەت باڵی دادو رەحمەت و ئەمانی بەسەر هەمو ولآتی موسوڵماناندا کێشابو، دەسەڵاتی سیاسی دامەزراو دادگاکان سەربەخۆو، بە یاساو رێسای رۆشنی مەزهەبەکان حوکم دەکران، بەرەکانی سەر سنور پڕ لە موجاهیدو، کۆمەڵگە مەدەنیەکەش لە مزگەوت و بازاڕدا زانایانی ئوممەت ئاراستەیان دەکرد..

منتدى إقرأ الثقافي

ئەو چەرخە سەردەمی یەحیای کوڕی موعین و، عەلی کوڕی مەدینی و، ئیسحاقی کوڕی راهۆیەو، ئیمام ئەحمەدی کوڕی حەنبەل و، بوخاری و، ئیبنو ماجەو، ترمزی، ئەبو داودو زانایانی تری حەدیس بو..

ئەو چەرخە سەردەمی ئیبنو سەعدو بلازەری و تەبەری، پێشەوایانی مێژونوسی بو.

سەردەمی ئیمام ئەبو حەنیفەی دینەوەری و، ئیبنو قوتەیبەو، جاحیزو، ئیبنو دورەیدو، موبەڕیدو، سەعلەب و، ئیبنو السسککیت و، مازنی بو، کە هەر یەکەیان سەر بەمەدرەسەیەکی زمان و ئەدەب و رێزمان و ێەرف بو...

ئەو چەرخە سەردەمی بوژانەوەی هەمو زانیاریەکانی دین و دنیا بو، چونکە سەردەمی خەلیفە بەهێزەکانی قۆناغی عەبباسیەکان بو... ئیمام موسلیمیش لە تەمەنی خۆیدا، حوکمی نۆ خەلیفەی لەوانە تێپەڕاند: مەئمون و، موعتەسەم و، واسیق و موتەوەککیل و، موستەعین و موعتەزو، موهەتەدی و، موعتەمەد، کە لە ١٦٨ ـ ٢٧٩ ك (٨١٣ ـ ٨٩٢ ز) حوکمیان کرد.

ئیمام لە سەردەمی خیلافەتی مەئمون دا لەدایکبو، لەو سەردەمەشدا نیسابور شارێکی بەناوبانگی ئیسلامەتی بو، یاقوتی حەمەوی گەشتیارو مێژو نوس دەربارەی دەڵێ: (شارێکی مەزنە، خەڵکێکی خاوەن پلەو پایەی تێدا دەژی، سەرچاوەی مەعدەنی پیاوان و زانایانە... لە هەمو ئەو وڵات و شارانەی بینیومن، من هیچیان وەکو نەیسابور نەبون. (معجم البلدان/ مادة نیسابور)...

## زانایان و ئیمام موسلیم

ئیمام نەوەوی (رحمەاللە) لە پێشەکی راڤەی حەدیسەکانی ئیمام موسلیمدا(صحیح مسلم بشرح النوي/ المقدمة ١١/١)، کە هەربە شەرحی نەوەوی بەناوبانگە، دەربارەی دەڵێ: زانایان لەسەر ئەوە کۆکن، کە ئیمام موسلیم خاوەن پلەو پایەیە، پێشەوایە، وردەکارێکی فەرمودەوانیی وریایە، خاوەن

منتدى إقرأ الثقافي

تەقواو شارەزایە، بە تایبەتی لە زانستی حەدیسدا، کە کتێبە سەحیحەکەی، بەڵگەی بلیمەتی و زیرەکی و بەرفراوانی بیرێتی، چونکە ئەو تەرتیبەی ئەو بۆ فەرمودەی کردوە، کەس پێش ئەو نەیکردوە، ئەو شێوە تۆمارکردنەی ئەو کردویەتیە ڕێسای فەرمودە، نە زیادەڕەوی تێدایە، نە نوقسانە.. موسلیم ئیمامێکە لە سەردەمی خۆیدا، کەم هەبون بێنە ڕیزی، لە دوای خۆشی، باوەڕ ناکەم کەسی دی بگاتەوە ناستی..

هەمو ئەو زانا بەڕێزانەی سەردەمی خۆی، ناویان لێنابو حافز..

- ئیمام موسلیم، یەکێکە لەوانەی بە بێ هیچ دودڵییەك ناونراوە حافز، چونکە لە مێژوی پڕ سەروەریی ئیسلامدا، یەکێکە لەو چوار زانایانەی، کە بڕی شەش سەد هەزار حەدیسیان لەبەر بوە! کە ئەبو زەرعەو ئەحمەدو بوخاری و موسلیمن... (تهذيب التهذيب ١٢٨/١٠ و تاريخ دمشق ٢٣٦/١٦)...

- یافعیش دەربارەی دەڵێ: موسلیم یەکێکە لە ئەرکانی حەدیس، خاوەنی سەحیحەو چاکەو خێری بەناوبانگەو مێژوی ژیانی پیرۆزو بەبەرەکەتە..(مرآة الجنان ١٧٤/٢ و تهذيب التهذيب ١٢٨/١٠ )...

- ئەبوبەکری جاوەردی دەڵێ: موسلیمی کوڕی ئەلحەججاج حەدیسی بۆ گێڕاینەوە، خۆی سەرچاوەی حەدیس بو...(تهذيب التهذيب ١٢٨/١٠ )

- مەسلەمەی کوڕی قاسم دەڵێ: موسلیم جێ متمانەیە، بەڕێزە، یەکێکە لە پێشەوایان.(تهذيب التهذيب ١٢٨/١٠)...

- ئیبنو ئەبی حاتەم دەڵێ: حەدیسم لە موسلیمەوە گێڕاوەتەوە، ئەو جێ متمانە بو، حافزی حەدیس بو، شارەزاییەکی چاکی لە فەرمودەوانیدا هەبو، کە دەربارەی ئەو لە باوکمیان پرسی گوتی: ڕاستگۆیە..(تهذيب التهذيب ١٢٨/١٠ ).

منتدى إقرأ الثقافي

## مامۆستاکانی ئیمام موسلیم

حافزی زەهەبی دەڵێ: یەکەمین جار، کە دەستی بە خوێندنی حەدیس کرد، ساڵی ٢١٨ك بو، چوە لای یەحیای کوڕی یەحیای تەمیمی و، ئەلقەعنەبی و ئەحمەدی کوڕی یونسی یەربوعی و، ئیسماعیلی کوڕی ئەبی ئوەیس و، سەعدی کوڕی مەنسورو، عەونی کوڕی سەلام و، ئەحمەدی کوڕی حەنبەل و، خەڵکێکی تری زۆر،(تذكرة الحفاظ ٥٨٨/٢).. ئیبنو حەجەری عەسقەلانی ئەوانیشی نوسیوەو، عەمری زەببی و، هەیسەمی کوڕی خاریجەو، شەیبانی کوڕی فەروخیشی بۆ زیاد کردون.(تهذيب التهذيب ١٢٦/١٠ )..

## فەقێکانی ئیمام موسلیم

حافزی ئیبنو حەجەرلە (تهذيب التهذيب ١٢٨/١٠) دەکەیدا دەڵێ: ئیمام ترمزی تەنها حەدیسێکی لێوە گێڕاوەتەوە، کە ئەویش لە یەحیای کوڕی یەحیاوە، لە ئەبو معاویەو، ئەویش لە محمدی کوڕی عەمر لە ئەبو سەلەمەوە، ئەمیش لە ئەبو هورەیرەوە خوا لێیان رازی بێت گێڕاوێتیەوە، کە پێغەمبەرﷺفەرمویەتی: (إحْصُوا هِلالَ شَعْبَانَ لِرَمضانَ). الترمذي ٦٨٧ .. دوابەدوای ئەمە حافزی ئیبنو حەجەر دەڵێ: ئەوانەی لێیانەوە گێڕاوەتەوە زۆرن، لەوانە: ئەبول فەزڵ ئەحمەدی کوڕی سەلەمەو، ئیبراهیمی کوڕی ئەبو تالیب و، ئەبو عەمر ئەلخەففاف و، حسەینی کوڕی محمد القەبانی و، ئەبو عەمر الموستەملی و، ساڵحی کوڕی محمد الحافزو، عەلی کوڕی الحەسەنی هیلالی و، محمدی کوڕی عبدالوەهاب الفەڕاو،(ئەم دوانەیان مامۆستاشی بون!) هەروەها عەلی کوڕی الحوسەینی کوڕی الجونەیدو، ئیبنو خوزەیمەو، ئیبنو ساعیدو، السیراج و، محمدی کوڕی عبدالحەمیدو، ئەبو حامیدو عبداللەی کوڕی ئیبنوشەرقی و، عەلی کوڕی ئیسماعیلی دوری و، ئیبراهیمی کوڕی محمدی

منتدى إقرأ الثقافي

کوڕی حەمزەو، ئەبو عەوانەی ئەسفەرائینی و، محمەدی کوڕی ئیسحاقی ئەلفاکیهی...

## گەشتی فەقێیەتی

ئیمام موسلیم، تا ئەو کاتەی زانیاری زانایانی وڵاتەکەی خۆی وەرگرت، سەرپێی خۆی کەوت و گەیشتە ئاستی پیاوی بەتواناو، توانای داراییشی ئەوەندەی تر بوە هاندەری، ئیدی گەشتی بۆخوێندن و زانست وەرگرتن بۆ زۆر وڵات کرد، لەوانە عێراق، حیجاز، شام، میسرو، لە خزمەت زانایانی ئەو وڵاتانەدا مایەوە، تا زانیاریەکانی شەرع و زمانی وەرگرت و، پێش زۆر لە مامۆستایانی خۆشی کەوتەوە!

ـ چوە خۆراسان و شار بە شاری گەڕا، چوە خزمەت قوتەیبەی کوڕی سەعیدو یەحیای کوڕی یەحیای نەیسابوری و، ئیسحاقی کوڕی راهۆیەو، بیشری کوڕی ئەلحەکەم.

ـ چوە ڕەی و لە خزمەت محمەدی کوڕی مەهران ئەلجەممالدا مایەوەو، پاشان چوە خزمەت ئیبراهیمی کوڕی موسای فەڕاو و، زەنیجا(نازناوی حافز ئەبو غەسسان محمدی کوڕی عەمری رازییە )..

ـ چوە عێراق(بەغداو کوفەو بەسرە) بۆ خزمەتی ئیمام ئەحمەدی کوڕی حەنبەل و، عوبەیدوللەی ئەلقەواریری و، خەلەفی کوڕی هیشامی ئەلبەززارو، عبداللەی کوڕی عەوف ئەلخەڕازو، شورەیحی کوڕی یونس و، سەعیدی کوڕی محمد ئەلحەرەمی و، عبداللەی کوڕی مەسلەمەی ئەلقەعنەبی و، ئەبو رەبیعی زەهرانی و، عومەری کوڕی حەفسی کوڕی غیاث و، ئەبا غەسسان مالیکی کوڕی ئیسماعیل و، ئەحمەدی کوڕی عبداللەی کوڕی یونس..

ـ چوە شام بۆ خزمەت محمدی کوڕی خالیدی سەکسەکی و، وەلیدی کوڕی موسلیم.

منتدى إقرأ الثقافي

ـ چوە حیجاز(مەککەو مەدینە)بۆ خزمەت ئیسماعیلی کوڕیئەبو ئوەیس و، ئەبو موسعەبی زوهری و، سەعیدی کوڕی مەنسورو، محمەدی کوڕی یەحیای کوڕی ئەبو عومەرو، عبدالجەباری کوڕی ئەلعەلاو..

ـ چوە میسر بۆ خزمەت محمەدی کوڕی رومح و، عیسای کوڕی حەممادو، حەرمەلەی کوڕی یەحیاو هی تر..

شوێنی وا هەبوە دو جار بۆی چۆتەوە..

## چۆنیەتی مردن و شوێنی بەخاك سپاردنی

ئیمام موسلیم، تا دەیەی شەشەمی تەمەنی پیرۆزی ژیا، تا ئەو ساتەی کۆچی دوایی کرد، هەر لە فێربونی فەرمودەوانی و فێرکردنیدا بو، تا ئەو کاتەی گیانی سپارد، هەر لە هاتوچۆی خزمەتی زانستی شەرعدا بو، تا لەو ساڵەی، کە تێیدا کۆچی دوایی کرد هاتەوە بۆ نەیسابورو، بینی سەروەت و سامانیشی زۆر زیادی کردوەو، پێویستە ئاوڕێکی لێ بداتەوە، ئیتر لەگەڵ فێرکردنکەشدا کەوتەوە بازرگانی، تا گیانی پاکی سپارد..

سیوطي لە(تدريب الراوي) دەڵێ: دەڵێن شەوی یەکشەممە بو، دوای تەمەنی شەست ساڵی مرد بۆ دوشەممەش ناشتیان، کە کردیە بیستو پێنجی رەجەبی ساڵی ٢٦١ ك (٨٧٥/٥/٦ ز) بەڵام ئیمام ئیبنو حەجەرو زەهەبی دەڵێن: ئەو کاتی کۆچی دوایی کرد، تەمەنی پەنجاو حەوت ساڵان بو، هەر ئەمانیشن، کە دەڵێن ئەو ساڵی ٢٠٤ ك لەدایکبوە.. بەڵام وا دیارە ئەوەی، کە ئیبنو خەلەکان دەڵێ لە تەمەنی پەنجاو پێنج ساڵیدا کۆچی دوایی کردوە راستتر بێت، چونکە ئەمیان توێژەرەوەیەکی وردتری، دەربارەی لەدایکبون و کۆچی دوایی کردنی کردوەو، ئیبنو سەلاحی شارەزوریش هەر ئەمەی پێ پەسەندتر بوە، هەروەها ئیمام نەوەویش، کە شەرحی سەحیحی موسلیمی کردوە..

منتدى إقرأ الثقافي

گومانی تێدا نیە، كە لە شاری نەیسابور كۆچی دوایی كردو، لە نەسراباد نێژرا، كە گۆڕستانێكی دەرەوەی نەیسابورە.. بەڵام هۆی مردنی زۆر سەیرە، ئەلبەغدادی لە حاكمی نەیسابوریەوە دەگێڕێتەوە، كە گوتویەتی: لە ئەبو عبداللەی كوڕی یەعقوبم بیست، كە وتی: لە ئەحمەدی كوڕی سەلەمەم بیست، كە وتی: كۆڕێك بۆ موسلیمی كوڕی ئەلحەجاج گیرابو، كە دەرسی تێدا دەوتەوە، حەدیسێكیان پێ وت: وتی: نەمبیستوە! ئێوارە، كە چوە ماڵەوە، چراكەی داگیرساندو وتی: كەس نەبات بۆ لام، پێیان وت: سەبەتەیەك خورمای تازەمان بۆ هاتوە، ناخۆیت ؟(هەندێك دەڵێن هەنجیر بوە) گوتی: بیهێنن، بۆیان هێنا، ئیتر هەر لەو حەدیسە دەگەڕاو خورمایەكی دەخوارد، كاتێك حەدیسەكەی دۆزیەوە، كە سەبەتە خورماكەی دەنك دەنك خواردبو !! حاكم دەڵێ: پیاوی متمانە پێكراوی راستگۆی خۆمان بۆی گێڕامەوە، كە ئا بەوە مرد..(تاريخ بغداد ١٣/١٠٣، تهذيب التهذيب / ابن حجر ١٠/١٢٧ ).. .

## بەرهەمەكانی ئیمام موسلیم

ئیمام موسلیم زۆر كتێبی نوسیوە، زۆربەیان دەربارەی فەرمودەوانین، هەیانە چاپ كراوەو، هەشیانە بە داخەوە، تا ئێستا هەر بە دەستنوسی ماوەتەوە !! زۆریشی هەبوە، كە بە دەست نەوەكانی نزیكی ئێمە نەگەیشتوەو، فەوتاوە!

منتدى إقرأ الثقافي

## کتێبە چاپکراوەکانی

### ١ـ سەحیحی موسلیم.

٢ـ المنفـردات و الوحـدات: دەربـارەی گێڕانـەوەی حەدیـسن، بـەو کەسـانەوە تایبەتە، کە تەنها یەك راوی لێوەی گێڕاونەتەوە، چ صەحابە بوە، چ تـابعینی دوای ئەوان.

### ب ـ دەستنوسەکانی:

١ـــ کتـــاب الكُنـــی والاسمـــاء: نـــاوی ئـــەو زانایانـــەی تێدایـــە، کـــە بـــە کونیەکانیان(ئەبو.. یان ئوممو.. یان ئیبنو.. یان بنتو...) بەناوبانگ بون، نـەك بە نـاوی ئەسڵی خۆیـان، یـان کونیـەی ئـەو کەسانەی، کـە بـە نـاوە ئەسڵیەکان زیاتر بەناوبانگ بون..

٢ـ کتاب التمییز: باس لەو ڕێگایانە دەکات، کە یارمەتیـدەری ئـەو خوێنـەرە لە کە فێری هەڵاوێردنی حەدیسی سەحیح و زەعیف دەبێت.. هەنـدێك نوسـەر نوسیویانەتەوەو، ناویان لێناوە (رسالة في المصطلح).

٣ـ رجـال عـروة بـن الـزبیر: بـاس لـەو پیاوانـە دەکـات، کـە حەدیـسەکانی عوروەی کوڕی زوبەیری کوڕی عەوامیان گێڕاوەتەوە و، دەیانناسێنیت..

٤ـ کتاب الطبقـات: بـاس لـەو یاوەرانـە دەکـات، کـە لـە خزمـەت پێغەمبـەردا بونﷺ و، کێ لێوەی ریوایەت کردون...

منتدى إقرأ الثقافي

## ج ـ ئەو کتێبانەی کە فەوتاون:

١ ـ الافراد. ٢ ـ افراد الشاميين. ٣ ـ الأقران. ٤ ـ الانتفاع بأهب السباع. ٥ ـ أولاد الصحابة فمن بعدهم من المحدثين. ٦ ـ أوهام المحدثين. ٧ ـ الجامع الكبير (ئەلحەکەم دەفەرموێ هەندێکیم بینیوە)... ٨ ـ حديث عمرو بن شعيب(عن أبيه عن جده ). ٩ ـ سؤالات احمد بن حنبل.. ١٠ ـ العلل. ١١ ـ كتاب التاريخ. ١٢ ـ المخضرمون. ١٣ ـ المسند الكبير على أسماء الرجال. ١٤ ـ مشايخ الثوري. ١٥ ـ مشايخ شعبة. ١٦ ـ مشايخ مالك بن أنس. ١٧ ـ من ليس له راو..

## ژمارەی حەدیسەکانی سەحیحی موسلیم

تا ئێستا بە شێوەیەکی بنبڕ، کەس نەیوتوە ژمارەی حەدیسەکانی سەحیحی موسلیم چەندە !! هۆیەکەشی ئەوەیە، کە دەقی هەندێك حەدیس لەناو هی تردا دوپات دەبێتەوە، ئیتر حەدیسی وا هەیە رستەیەکە، یان رستەیەکەو ئەسڵە، بەڵام لە جێیەکی تردا، رستەیەکی تری تەواوکاری هەیە، یا لێی کەم کراوەتەوە، بۆیە جاری وا هەیە ئەسڵەکە بە حەدیسێك حسێب کراوەو پاشتر، کە زیادەیەکی تری لەگەڵ هاتوە، وا حسێب کراوە، کە حەدیسێکی ترە.. هەرچەندە یەکێکی وەکو ئیمام نەوەوی، لە هەمو کەس زیاتر بایەخی بە سەحیحی موسلیم ورافەکردنی داوە، کەچی ئامازەی بەو مەسەلەیە هەر نەکردوە، وا دیارە هیچ بەلایەوە گرنگ نەبوە، کە چەند حەدیسە، بەقەدەر ئەوەندەی، کە پێی گرنگ بوە، موسوڵمانان لێی حاڵی ببن و کاری پێ بکەن..

ئەبو قورەیشی حافز، کە هاوچەرخی ئیمام موسلیم بو دەڵێ: حەدیسی موسلیم چوار هەزار حەدیسە.. ئەمیش مەبەستی لە ئەسڵەکانە نەك ئەوانەش، کە لەگەڵ ئەو ئەسڵانەدا دوپات بونەتەوە..(تاريخ دمشق ٢٣٦/١٦ و شرح صحيح مسلم / النوي ٢١/١ ). ئیبنوسەلاحیش هەر گوتوە..(الباعث

منتدى إقرأ الثقافي

الحثيث شرح اختصار علوم الحديث تحقيق احمد شاكر ل ٢٠ )..

سەبارەت بە ئەسڵ و ئەوانەی، کە دوپاتن، کەس ناکۆکی لەسەر ئەوە نەبوە، کە وەکو حافزی عێراقی لە ئەحمەدی کوڕی مەسلەمەوە گێڕاوێتیەوە، هەموی دوازە هەزار حەدیسە (الباعث الحثيث و تذكرة الحفاظ ١٥١/٢).

## مەرجەکانی ئیمام موسلیم بۆ حەدیس بە سەحیح دانان

ئیمام بوخاری و ئیمام موسلیم، مەرجی تایبەتی خۆیان بۆ سەحیح دانانی حەدیس نەنوسیوە، بەڵام فەرمودەوانان سەیریان کردوە، هەر یەکەیان بە پێی رێساو مەرجێکی تایبەت، کە نەیاننوسیوەتەوە حەدیسیان بە سەحیح تۆمار کردوە، فەرمودەوانان سەیریان کردوە، لای هەردوکیان ئەو حەدیسە قبوڵ بوە، کە ئەم سیفەتانەی لە سەرەتاوە، تا کۆتایی بێ هیچ لارو وێریەك تێدا بوبێت: (سەنەدی پەیوەست، وەرگرتن لە دادپەروەرەوە، وردەکاری لە گێڕانەوەیدا ).. بڕوانە(صحيح مسلم ١٥/٢ كتاب الصلاة، باب التشهد في الصلاة، تذكرة الحفاظ / الحافظ الذهبي ٥٨٩/٢ ).

ئیمام موسلیم بە مەرجی سەحیح بونی حەدیسی دانابو، کە دەبێت ئەو کەسەی حەدیسێك لە کەسێکی ترەوە دەگێڕێتەوە، لە یەك سەردەمدا ژیابن، بەڵام ئیمام بوخاری دەیگوت، مەرجیشە، کە یەکتریان دیتبێت، با یەکجاریش بوبێت.. ئەمەش مەرجی ئیمام موسلیمی لاواز نەکردوە، چونکە هەمو شارەزایانی فەرمودە دەزانن، کە ئیمام موسلیم دەیگوت، کە متمانە پێکراو(ثقة) {زاروەیەکی فەرمودەوانیەو پلەیەکی پێشکەوتوە} لە کەسێکەوە ناگێڕێتەوە، کە نەیناسێت و لە خۆیەوە وەرنەگرتبێت و، لە کەسێکیشەوە وەرناگرێت، کە وەسفی شیاوێتی و متمانەیی دەربارەی نەبیستبێت...

منتدى إقرأ الثقافي

## کتێبەکەی موسلیم هەمو سەحیحەکانی تێدا نیە

کتێبەکەی ئیمام موسلیم بەدڵنیاییەوە، هەمو حەدیسە سەحیحەکانی ئەوی لەخۆ نەگرتوە، چونکە خۆی دەڵێ: هەمو حەدیسە سەحیحەکانم لێرەدا(واتە لە کتێبەکەی خۆیدا) تۆمار نەکردوە، بەڵکو تەنها ئەو حەدیسانەی، کە لەسەری رێکەوتون، کە سەحیحن ..(بڕوانە صحیح مسلم/ النوي ٢٥/١ ـ ٢٦ ).

ئیمام موسلیم ئەم حەدیسە تۆمار کراوانەی خۆی، لە کۆی سێ سەد هەزار حەدیس هەڵبژاردوەو نوسیونی !! وەکو خۆی گوتویەتی: (ئەم کتێبەم لە بڕی سێ سەد هەزار حەدیس هەڵبژاردوە، کە هەمویم بۆ خۆم بیستوە ).. ئەمەش وای کردوە هەندێك کەس بە هەڵە تێبگەن، کە ئەوەی ئیمام موسلیم تۆماری نەکردون سەحیح نەبون بۆیە لێیان گەڕاوە، بەڵام وا نیە، جا وا دیارە ئەم گومانە هەر لەسەردەمی خۆشیدا وا بیستراوە بۆیە خۆی لە سەحیحەکەیدا دەڵێ: (من ئەم کتێبەم، کە ناساند، وتم حەدیسەکانی سەحیحن، نەموت ئەوەی لێرەدا نەمنوسیون زەعیفن، نا، من مەبەستم ئەوە بو، کە هەر کەس حەدیس لە منەوە وەردەگرێت، با لەوە بێگومان بێت کە فەرمودەی سەحیحی لێمەوە وەرگرتوە.. ئیمامانی فەرمودەوانی وەکو، الحاکم و، ئیبنو سەلاح نەوەوی و، سیوتی و هەمو ئەو بەڕێزانەش جەختیان لەمە کردۆتەوە.. ئینجا ئەوان گوتویانە کە ئیمام موسلیم ئەو هەمو حەدیسەی تری تۆمار نەکردوە. لەبەر ئەوە بوە کە:

١ـ مەبەستی ئەوە بوە کتێبەکەی گەورەتر نەبێت.

٢ـ یان خۆی لەبەر هۆیەك، کە پێی وا بوبێت زەعیفە تۆماری نەکردبن.

٣ـ یان بیری چوە.

٤ـ یان وای داناوە، کە ئەو حەدیسانەی گێڕاونیەوە، بەسن و جێی ئەوانەش

منتدى إقرأ الثقافي

دەگرنەوە، کە تۆماری نەکردون..

٥ـ یان هۆی تر هەیە..

بۆیە ئیمام نەوەوی لە راڤەی کتێبی سەحیحی موسلیمدا دەڵێ: موسلیم بە تەئکید هەمو حەدیسەکانی پێغەمبەریﷺ نەگێڕاوەتەوە، نەك نیوەشی نەگێڕاوەتەوە، بەڵکو هەر ئەوەندەیە، کە دەوترێت: هەندێکی گێڕاوەتەوە..(شرح مسلم / النوی ١/٢٤ )..

## راڤەکردنی سەحیحی موسلیم

کتێب لەسەر سەحیحی موسلیم زۆر نوسراون و، زۆریش هەن راڤەی یەك یەکی حەدیسەکانیان کردوە، ئیتر هەیانە بە دورودرێژیی و، هەیانە بە کورتی و، هەشە مامناوەندیە.. لەوانە:

ـ إكمال المعلم / القاضي عياض ت ٥٤٤ ك/ ت يحيى إسماعيل/ الناشر دار الوفاء / ٩ بەرگە لە چاپخانەی السعادة چاپکراوەتەوەو مكمل إكمال الإكمال یشی لەگەڵدایە.

ـ إكمال إكمال المعلم/ الامام عبدالله محمد بن خليفة الوشتاني لابي التونسي المالكي ٨٢٧ ك ٤ بەرگەو راڤەی مازری وعیازو قورتوبی ونەوەوی لەگەڵدا چاپ کراوە.

اكمال الاكمال/ ابو الروح عيسى بن مسعود الزواوي المالكي ٧٤٤ ك.

ـ الايجاز و البيان لشرح خطبة كتاب مسلم مع كتاب الايمان / ابن الحاج قاضي قرطبة ٥٢٩ ك/ ١١٣٤ م.

ـ بغية القارئ والمتفهم: يحيى بن محمد السنباطي ٩٥٨ ك.

ـ تحفة المنجد والمتهم في غريب صحيح مسلم/ نوسەرەکەی نەزانراوە بەڵام لە ٨١٦ ك ژیاوە..

ـ تفسير غريب الصحيحين/ الحميدي ٤٨٨ ك.

منتدى إقرأ الثقافي

ـ تكملة فتح الملهم بشرح صحيح مسلم /تأليف محمد تقي العثماني / الناشر مكتبة دار العلوم ٦ بەرگە.

ـ حاشية ابي الحسن بن عبدالهادي السندي ١١٢٦ ك.

ـ حاشية شرح مسلم / علي بن احمد السعيدي ١١٦٨ ك.

ـ حاشية على صحيح مسلم / تأليف السندي ت١١٣٦ ك/ طبعت في باكستان.

ـ الحل المفهم لصحيح مسلم / من إفادات الشيخ رشيد الكنكوهي الأنصاري ت ١٣٢٣هـ/ بەشی یەکەمی لە ساڵی ١٤٠٣ك بە توێژینەوەی محمد زكريا الكاندهلوي لە کەراچی پاکستان چاپ کراوە.. .

ـ ختم صحيح مسلم/ عبدالقادر النادمي ٩٢٧ ك.

ـ الديباج على صحيح مسلم بن الحجاج/ السيوطي ت ٩١١ ك / ت أبي إسحاق الحويني/ الناشر دار عفان/ ٦ م بەرگە ولە ١٢٩٩ك لە المطبعة الوهبية/ت بديع السيد اللحام ٢ بەرگە.

ـ السراج الوهاج من كشف مطالب صحيح مسلم بن الحجاج/ صديق خان القنوجي مطبعة الصديقي ساڵی ١٣٠٢ ك ٢ بەرگە و وزارة الشؤون الإسلامية بدولة قطر چاپی کردوە بە ناوی طبعة خيرية/ ١٣ بەرگە، ئەمە هەر ڕافەی مختصر صحيح مسلم/ المنذريه.

ـ شرح الامام ابي القاسم اسماعيل بن محمد الاصفهاني الحافظ ٥٣٥ ك.

ـ شرح عماد الدين عبدالرحمن بن العلي المصري ٦٢٤ ك.

ـ شرح شمس الدين ابي المظفر يوسف بن فزأوغلي سبط ابن الجوزي ٦٥٤ك

ـ شرح كتاب(مختصر صحيح مسلم) للحافظ المنذري / عثمان بن عبدالملك الكردي المصري ٧٣٧ ك.

ـ شرح كتاب(مختصر صحيح مسلم) للحافظ المنذري / محمد بن احمد الاسنوي ٧٦٣ ك

ـ شرح ابن المهندس / عبدالله بن محمد الصالحي الحنفي ٧٩ ك.

منتدى إقرأ الثقافي

ـ شرح محمد بن محمود البابرتي ٧٨٦ ك.

ـ شرح الشيخ شمس الدين محمد بن يوسف القونوي الحنفي ٧٨٨ ك.

ـ شرح زوائد مسلم على البخاري/سراج الدين عمر بن علي بن الملقن الشافعي٨٠٤ ك ٤ بەرگە.

ـ شرح الشيخ تقي الدين ابي بكر بن محمد الحصني الدمشقي الشافعي ٨٢٩ ك

ـ شرح خطبة مسلم بن الحجاج: القسطلاني الشافهي ٩٢٣ ك.

ـ شرح القاضي زين الدين زكريا بن محمد الانصاري الشافعي ٩٢٦ ك.

ـ شرح شهاب الدين احمد بن عبدالحق ٩٦٢ ك.

ـ شرح مولانا علي القاري الهروي ١٠١٦ ك ٤ مجلد.

ـ شرح صحيح مسلم / ابراهيم بن محمد العجمي الحلبي.

ـ شرح صحيح مسلم / عبدالرؤوف المناوي ١٠٢١ ك.

ـ صيانة صحيح مسلم من الإخلال والغلط.. / ابن الصلاح ت ٦٤٢ هـ / تحقيق موفق عبد القادر / دار الغرب الإسلامي / يەك بەرگە ئەويش راڤەی كتاب الايمانی سەحيحی موسليمە. كە بيت الأفكار الدولية لەچاپ كراوە.

ـ عناية المنعم لروح صحيح مسلم(عناية الملك المنعم) / عبدالله بن محمد يوسف أفندي زادة حلمي ١١٦٧ ك.

ـ غنية المحتاج في ختم صحيح مسلم بن الحجاج/محمد بن عبدالرحمن السخاوي ٩٠٢ ك

ـ فتح المنعم شرح صحيح مسلم / موسى شاهين لاشين / مؤسسة عز الدين / ٥ بەرگە.

ـ فتح الملهم بشرح صحيح مسلم / شبير احمد الديوبندي العثماني ت١٣٦٩ ك/ المكتبة الرشيدية / ٢ بەرگە تا كتاب الرضاع گەيشتوە.

ـ فضل المنعم في شرح صحيح مسلم:شمس الدين بن عبدالله بن عطاء الله الرازي ٨٢٩ك

منتدى إقرأ الثقافي

ـ المعلم بفوائد مسلم/تأليف المازري ت ٥٣٦ هـ/ تحقيق الشاذلي النيفر/ دار الغرب الإسلامي/ ٣ بەرگە.

ـ المعلم بشرح المختار من صحيح مسلم / محمد محمد السماحي زانايەکی ئەزهەرەو راڤەی ١٨ حەدیسی هەڵبژاردەی کردوە توێژینەوەی کراوە.

ـ المفصح المفهم والموضع الملهم لمعاني صحيح مسلم/ ابو عبدالله محمد بن يحيى الانصاري ٦٤٦ ك.

ـ المفهم شرح تلخيص صحيح مسلم/ أبي العباس احمد بن عمر بن ابراهيم القرطبي ت٦٥٦ ك/ تحقيق محيي الدين مستو وجماعة/ الناشر دار ابن كثير/ ك ٧ بەرگە، لە دار الكتاب المصري/ توێژینەوەی الحسني أبو الفرجة ٣ بەرگە، لە قسم السنة لە جامعة الإمام محمد بن سعود الإسلامية ش توێژینەوەی کراوە.

ـ المفهم في شرح غريب سلم/ الامام عبدالغافر بن اسماعيل ٥٢٩ ك.

ـ مكمل إكمال المعلم للسنوسي ت٨٩٢ ك/ مطبعة السعادة/ ٧ بەرگە لە دار الكتب العلميەش چاپ کراوە ٩ بەرگە..

ـ منهاج الابتهاج بشرح صحيح مسلم بن الحجاج / شهاب الدين احمد بن الخطيب القسطلاني الشافعي ٩٢٣ك.

ـ المنهاج شرح صحيح مسلم بن الحجاج(منهاج المحدثين وسبيل تلبية المحققين/ النوي ت ٦٧٦ ك/ زۆر جاران چاپ کراوە بەڵام باشترینیان چاپی دار المعرفة/ تحقيق خليل مأمون شيحايە کە ١٠ بەرگە.

ـ منة المنعم شرح صحيح مسلم/ الشيخ صفي الرحمن المباركفوري / دار السلام عام ١٤٢١ك/ ٤ بەرگە.

ـ وشي الديباج على صحيح مسلم بن الحجاج/ علي بن سليمان البجمعوي

منتدى إقرأ الثقافي

ت١٢٩٨ ك / الناشر المطبعة الوهبية یەك بەرگەو كورتەی اليباجی سيوتيه..

بێگومان راڤەی سەحيحی موسليم بە زمانەكانی تر، هەر زۆر زۆرە، لەوانە بە فارسی بە ناوی(منبع العلم)، كە نور الحق بن عبدالحق الدهلوی نوسيوێتی كە لە ١٠٧٣ كۆچی دوايی كردوە، بەڵام تەواوی نەكردبو، ئيبن فخر الدين محب الله تەواوی كردوە.. بە داخەوە، كە بە كورديش نيمانە...

منتدى إقرأ الثقافي

# کورتەیەك لەسەر سەحیحی موسلیم و باسێك لە شێوازی دانانەکەی

زانایانی ئیسلام دابەشکردنی کتێبیان بەم شێوەیە دەکرد: (کتاب...) ئەمەش کۆبەندێك بو چەندین بەندی لە خۆ دەگرت، کە ناویان دەنا(باب... )، هەر بابێکیش دەبوە چەندین باسەوە، کە ناویان دەنا(مسألة.. ).. ئیمام موسلیم لە کتێبی سەحیحەکەی خۆیدا لە(کتاب المساجد) بەندێکی هەیە، کە ناوی ناوە(باب فضل صلاة الجماعة والتشديد في التخلف عنها) دەڵێ: ئەبوبەکری کوڕی ئەبو شەیبە بۆی گێڕاینەوە، کە الفضل کوڕی دوکەین، لە ئەبو العومەیس لە عەلی کوڕی الاقمەروە، ئەویش لە ئەبو الاحوەس و ئەویش لە عبداللەوە(مەبەست عبداللەی کوڕی مەسعودە) گێڕاویانەتەوە، کە گوتی: (مَنْ سَرَّهُ أن يَلقَى اللهَ غداً مُسلِماً، فليحافِظْ على هؤلاء الصلواتِ حيثُ يُنادى بهِنَّ، فإنَّ اللهَ تعالى شَرَعَ لنبيكم صلى الله عليه وسلم سُنَنَ الهُدَى، وإنهُنَّ مِنْ سُنَنِ الهُدى، ولو أنّكمْ صَلّيتم في بيُوتِكُم كمَا يُصلّي هذا المتخلّفُ في بَيتهِ ؛ لتركْتم سُنّة نبيّكم، ولو تركْتم سُنّة نبيّكمْ لضَلَلتم وَمَا مِنْ رَجُلٍ يَتطهّرُ فيُحْسِنَ الطهورَثمّ يَعْمُدُ إلى مَسجدٍ من هذهِ المساجدِ إلا كَتبَ اللهُ لهُ بكُلّ خَطوَةٍ يخطوها حَسَنَةً ويَرفعُهُ بها دَرَجَةً ويَحُطُّ عنهُ بهَا سَيئةً وَلَقَدْ رَايتنا وما يَتخلّفُ عَنها إلا مُنافِقٌ مَعلومُ النّفاقِ، وَلَقَدْ كَانَ الرّجُلُ يُؤتَى بِهِ يُهَادَى بينَ الرّجُلَين حتى يُقَامَ في الصّفِّ)،[١] واتە: هەر کەسێك حەز دەکات سبەینێ موسوڵمانانە بە خزمەت خودای خۆی بگات، با پارێزگاری ئەو نوێژانەی بکات، ئەو نوێژانە ڕێبازی ڕێنمایی خواین، ئەگەر ئێوە وەکو ئەم دواکەوتوە نوێژەکاناتن لە ماڵەوە بکەن، ئەوە مانای وایە سوننەتی

---

١ صحيح مسلم بشرح الامام النووي/ دار الكتب العلمية/ بيروت ١٥٦/٥...

منتدى إقرأ الثقافي

پێغەمبەرەکــەی خۆتــان وازلێهێنــا، ئەگــەر ســوننەی پێغەمبەرەکەشــتان وازلێبهێنن؛ گومڕا دەبن، هەر کەس بە تەواوی دەستنوێژی خۆی بگرێت و بچێت بۆ مزگەوتێك، خوای گەورە بە هەر هەنگاوێکی، کە دەینێت، خێرێکی بۆ دەنوسێت و، پلەیەکی بەرزتر دەکاتەوەو، بە هەر هەنگاوێکی، خراپەیەکی لەسەر دەکوژێنێتەوە، ئاخر بۆیە دەتبینین، کەس لێیان دوا نەدەکەوت، مەگەر کەسێکی دوڕو، کە بە دوڕویەکەی ناسرابێت، تەنانەت کەسی وات دەبینی، وا دو کەسی دیکە بن هەنگڵیان خستۆتە سەر شانی خۆیان و، بەو شێوەیە دەیهێنن، تا لە ڕیزی نوێژیان دادەنا..

## بەراوردێك لە نێوان هەردو سەحیحەکەدا

هەردو شێخەکەی ئیسلام، بوخاری و موسلیم ڕەحمەتی خوایان لێ بێت، هەرچی لە توانیاندا بوە، بۆ ڕێك و جوان دانان و نوسینی کتێبەکەیان، خەرجیان کردوەو درێغیان نەکردوە، مەرجی وردیان بۆ کۆکردنەوەو، پاشان بۆ تۆمار کردنیان داناوە، کە هەمو فەرمودەوانان پێیان سەرسام بون و، شایەتی شۆڕەسوارێتی ئەو دو زاتە پاکەیان، لەو بوارەدا داوە، ئوممەتەکەش بە کتێبی متمانە پێکراوی دین و دینداریی وەرگرتون، زانایانی ئیسلام لە کۆن و نوێدا لەسەر ئەوە کۆن، کە ئەو دو کتێبەی بوخاری و موسلیم ڕاستترین کتێبی موسوڵمانانن دوای قورئانی پیرۆز.. ئیمام ئیبن تەیمیە دەڵێ: لە بن ئەم ئاسمانەدا لە دوای قورئانی پیرۆز، کتێبێکی تری ڕاستی تێدا نیە، وەکو سەحیحەکانی بوخاری و موسلیم..(مجموع الفتاوي ٧٤/١٨ ).

ئیمام بوخاری هەر کتابەی بە جیا ناوناوەو، حەدیسەکانی تێدا تۆمار کردوە بەڵام لە جێی تریشدا حەدیسەکان دوبارەو سێبارە دەکاتەوە، چونکە پەیوەندیان بە زیاتر لە یەك باسەوە هەیە، یان بۆ سودی زیاتر، یان بۆ تەئکید لە سەنەدەکەیان، دیسان دەیانهێنێتەوە. بەڵام ئیمام موسلیم وای نەکردوە،

منتدى إقرأ الثقافي

بەڵكو هاتوە هەمو حەدیسەكانی ئەو بابەتەی بە سەنەدە جیاوازەكانیەوە، بەیەكەوە لە یەك شوێندا هێناوە، بۆیە ئەوەی ئەم، كە بۆ سەرجەم حەدیسی باسێك دەگەڕێت، ئاسانكاریەكی زیاتری تێدایە، بەڵام ئەم وەكو ئیمام بوخاری، سەردێڕی وای بە ناوی(كتاب...) وە بۆ نەنوسیون.. هەر چەندە دیارە، كە بە پێی بابەت و باسەكان ڕێكی خستون..

لە سەنەدی حەدیسەكانیشیاندا جیاوازیەكیان هەیە، بۆ نمونە پیاوانی لای ئیمام بوخاری، لە چوارسەدو سی قسور كەسدا، باسی هەشتا كەسی كردوە، كە قسەیان لەسەرەو هەندێك حەدیسیان پێ لاواز دەبێت، بەڵام لە پیاوانی سەنەدی حەدیسەكانی ئیمام موسلیمدا، كە شەش سەدو بیست كەسن، قسە لەسەر سەدو شەستیان دەكات، كە لە هەندێك سیفاتدا زەعیف بون..(تدریب الراوي / سیوطي ۹۲/۱ ).

بۆچی سەحیحی بوخاری لەپێشترە، وەك لە سەحیحی موسلیم ؟

زۆرینەی زانایان، سەحیحی بوخارییان پێش سەحیحی ئیمام موسلیم داناوە، هەرچەندە هەندێك زانای وڵاتی مەغریبی ئیسلامی، هەر سەحیحی موسلیمیان پێش بوخاری خستوە.

- ئیبنوس سەلاح دەڵێ: ئەوەی، كە گێڕامانەوە، كە ئیمام شافیعی گوتویەتی كتێبێكی تر لەم سەر زەمینەدا لە(مُوَطأ )ی مالیك ڕاستر نیە، لە ریوایەتێكی تریدا: كتێبێكی تر غەیری كتێبەكەی خوای گەورە لەم سەر زەمینەدا، لە (مُوَطأ )ی مالیك راستر نیە، لەبەر ئەوەیە، كە ئەو زەمانەی ئەو ئەوەی گوت، هێشتا كتێبەكانی بوخاری و موسلیم دانەنرابون..

- حافزی ئیبنو حەجەری عەسقەلانی، كە ڕاڤەی حەدیسەكانی بوخاری كردوە دەڵێ: ئەوەی وای كردوە، كە زانایان كتێبەكەی بوخاریان بەلاوە پەسەندتربێت ئەوەیە، كە دەبینرێت لە سەنەدی حەدیسدا لە موسلیم وردەكارتر بوەو، لە حەدیسیشدا شارەزاتر بوە..(تدریب الراوي ۹۱/۱)

منتدى إقرأ الثقافي

ـ ئیمام ئیبنو تەیمیە دەڵێ: زانایان لەسەر ئەو رایەن، کە بوخاری لەپێشترە وەك لە موسلیم، چونکە لە زانستەکانی فەرمودەدا شارەزاترە، موسلیمیش قوتابی بەردەستی بوخاری بوەو، لەبەر دەستی ئەودا فێری ئەم زانستیانە بوە، بەردەوامیش هەر موسلیم زیاتر سودی لە زانایی بوخاری وەرگرتوە، بۆیە یەکێکی وەکو الدارەقوتنی دەڵێ: ئەگەر بوخاری نەبوایە، موسلیم نەدەهات و نەدەچو.

ـ شاعیر جوانی وتوە، کە باسی هەردوکیانی ئاوا کردوە:

تشاجر قوم في البخاري و مسلم　　　لدي وقالوا: أي ذين تقدم

فقلت: لقد فاق البخاري صحة　　　كما فاق في حسن الصناعة مسلم

واتە: کۆمەڵە کەسێك لە فەزڵی بوخاری و مەسلیمدا ناکۆك بون و هاتنە لام، وتیان کام لەو دوانە پێش دەخەیت؟ وتم: بوخاری، پێش موسلیمی، بە راستی حەدیسەکانی کەتوە، بەلام موسلیمیش بە دیقەت و وردەکاری رێکخستنەکەی پێش ئەو کەوتۆتەوە ..

ڕەحمەتی خوا لە هەمویان بێت و، خوای گەورە بمانخاتە سەر رێی ئەو کەڵەپیاوانەی ئوممەتی موسوڵمان... ئامین...

منتدى إقرأ الثقافي

# ئیمام ئەبو داود( رحمه الله )

(٢٠٢ ـ ٢٧٥ ك)

ـ حافز ئەحمەد الهورەوی گوتویەتی: (ئەبو داود یەکێك بو لە پارێزەرانی ئیسلام، بەو هەمو حەدیسەی لەبەری بو).

## ناو و ڕەچەڵەکی

ئەبو داودی دادپەروەرو بە دیققەت، گەورەی حافزانی حەدیس، ناوی سولەیمانی کوڕی ئەشعەسی کوڕی ئیسحاقی کوڕی بەشیری کوڕی شەددادی کوڕی عەمری ئەلئەزەدی ئەسسەجستانیە.

ـ دەشڵێن: سولەیمانی کوڕی ئەشعەسی کوڕی شەددادی کوڕی عەمری کوڕی عامرەو، پێی وتراوە عیمران.

ـ حافز ئیبنو حەجەری عەسقەلانی دەڵێ: دەڵێن عیمرانی باپیرەی، لە شەڕی ناوخۆی سفغیندا، لە ڕیزی سوپای سەیدنا عەلی کوڕی ئەبو تالیبدا بو، کوژرا.. (تهذیب التهذیب ١٦٩/٤ ).

ـ ئەلئەزەدی: ناوی تیرەی ئەزدە، کە هۆزێکی بەناوبانگی یەمەن بون.

ـ ئەسسەجستانی: ناوی ناوچەیەکە، بەڵام جوگرافیا ناسان تێیدا ڕاجوێن، هەیانە دەڵێ: ناوەکە سەجستانەو ناوی ئەو ویلایەتە بوە، کە لە باشوری ڕۆژهەڵاتی خۆراسانی کۆنەوە بوە، واتە نێوان ئێران و پاکستانی ئێستا(کە هەرێمی بەشکراوی بەلوچستانی ئەم سەردەمەی ئێمەیە)، هەندێکی تریان دەڵێن، ئەسڵەکەی سەجستانەیە و گوندێك بوە سەر بە شاری بەسرە. هەندێکی

منتدى إقرأ الثقافي

تر دەڵێن: ناوچەیەك بوە، نزیك بە وڵاتی هیندۆسی کۆن، (طبقات الشافعية الكبرى ٢٩٣/٢) هەشیانە دەڵێ: سەجستان شارۆچکەیەك بوەو، ئێستا لە ئەفغانستاندایە..

ـ لەدایکبونی: ئیمام ئەبو داود لە ساڵی ٢٠٢ ك لەدایکبوە (طبقات الشافعية الكبرى ٢٩٣/٢) باوکی دانیشتوی بەسرە بو، ئەبو داود چەند جار چۆتە بەغدا، کۆتا جاریان ساڵی ٢٧١ ك بو(مفتاح دار السعادة ٩/٢) بەسرەی ئەو سەردەمە، مەڵبەندی زانایان و خوێندکارانی شەرع بو..

ـ خوێندنی: ئەوی دەربارەی گەشتی خوێندنی ئەبو داود هەیە کەمە، بەڵام ئەوەی زۆر زەقە، کە لە هەر شوێنێك بوە، یەکسەر بایەخی زۆری بە زانستی فەرمودە داوە، لەو سەردەمەی ئەو، کە دەستی بە خوێندن کردوە، فەرمودەوانی باوی بو، لە سەرانسەری جیهانی موسوڵماناندا، سەفەر بۆ کۆکردنەوەی حەدیس و تۆمار کردن و، بە ڕێسایی کردنی زانستی حەدیس دەستی پێ کردبو، بۆیە ئەمیش بۆ ماوەی چەندین ساڵ لەسەر یەك، هەر بۆ خوێندنی حەدیس و کۆکردنەوەو تۆمار کردنی خۆی ساغ کردبۆوە.. لەو کارە پیرۆزەیدا چۆتە زۆرینەی مەڵبەندەکانی خوێندن، لە بەسرەوە بۆ خۆراسان و، لەوێشەوە هاتۆتەوە بۆ میسر، ئینجا بۆ حیجاز..

ـ حافز ئیبنو کەثیر دەرهەقی ئەبو داود دەڵێ: ئەبو داود یەکێکە لە فەرمودەوانان و گەشتیارانی زانستی حەدیس، زۆر شوێن بۆ کۆکردنەوەی حەدیس و تۆمار کردنی گەڕاوە..(البداية والنهاية ٥٤/١١) ماوەی بیست ساڵ لە شاری تەرتوس(لە سوریای ئێستایە) ماوەتەوەو چوەتە دیمەشق.(تهذيب ابن عساكر الدمشقي ٢٤٤/٦)...

منتدى إقرأ الثقافي

## مامۆستاکانی

ئیمام ئەبو داود گومان لەوەدا نیە، کە وەکو هەر هەڵکەوتویەکی تر، لای کۆمەڵێکی زۆر لە زانایانی ئیسلام خوێندویتی، کە هەمویان هەر لە ژمارە نایەن (مفتاح دار السعادة ٢/٩) ئیمام ئیبنو حەجەری عەسقەلانی دەڵێ: ژمارەی مامۆستاکانی لە سێ سەد زانا زیاترن!! (تهذیب التهذیب ١٧٢/٤ )... بەڵام ئەمە ناوی بیست زانا لە بەناوبانگەکانیان:

١ـ ئەبو عبداللە ئەحمەدی کوڕی محمدی کوڕی حەنبەلی شەیبانی ئەلمورۆزی(١٦٤ ـ ٢٤١ك).

٢ـ ئەبو زەکەرییای یەحیای کوڕی مەعین(٠٠٠ـ ٢٢٣ ك) کە مامۆستای ئیمام ئەحمەدی کوڕی حەنبەلیش بو..

٣ـ ئیسحاقی کوڕی راهەوەی، کە یەکێکە لە ئیمامانی ئەهلی سوننەت(١٦١ـ ٢٣٨ ك.

٤ـ عوسمانی کوڕی محمدی کوڕی ئەبو شەیبە، یەکێك لە حافزانی هەزاران حەدیس (٠٠ـ ٢٣٩ ك)

٥ـ موسلیمی کوڕی ئیبراهیمی ئەزەدی ئەلفەراهیدی(٠٠٠ـ ٢٢٢ ك)، کە مامۆستای یەحیای کوڕی مەعین و ئیمام بوخاریش بو..

٦ ـ عبداللەی کوڕی مەسلەمەی کوڕی قەعنەبی، ئەلقەعنەبی ئەلمەدەنی (٠٠٠ ـ ٢٢١ ك).

٧ـ حافز موسەددەدی کوڕی موسەرهەدی کوڕی موسەربەلی بەسری ئەلئەسەدی(٠٠٠ـ ٢٢٨ ك ).

٨ـ حافز محمدی کوڕی بەشاری کوڕی عوسمانی ئەلعەبدی ناسراو بە بندار(٠٠٠ ـ ٢٥٢ ك).

٩ـ حافز ئەبو خەیسەمە زوهەیری کوڕی حەربی کوڕی شەدداد(٠٠٠ـ٢٣٤ ك).

منتدى إقرأ الثقافي

١٠. ئەبو حەفس عومەری كوڕی خەتتابی سەجستانی دانیشتوی ئەهواز(٠٠٠ ـ ٢٦٤ ك).

١١. حافز ئەبو نەسسەری هەنادی كوڕی السسەری (٠٠٠. ٢٤٣ ك)

١٢. ئەبو سەلەمە موسای كوڕی ئیسماعیلی تەمیمی ئەلونەقەری(٠٠٠ـ ٢٢٣ ك).

١٣ـ ئەبو عوسمان عەمر ئەنناقدی كوڕی محمەدی كوڕی بەككیری كوڕی شاپوری بەغدادی(٠٠٠ ـ ٢٢٢ ك )

١٤. حافز ئیمام نەسری كوڕی عەلی ئەلەهزەمی ئەزەدی (٠٠٠. ٢٥٠ ك).

١٥ ـ حافزی گەورە ئەبو كورەیب محمەدی كوڕی العەلائی كوڕی كورەیبی هەمەدانی كوفی(٠٠٠ ـ ٢٤٨ ك).

١٦ ـ ئەبو عوسمان عەمری كوڕی مەرزوقی باهیلی بەسری (٢٢٤.٠٠٠ ك)

١٧ ـ حافز ئەبو موسا محمەدی موسەننای كوڕی عوبەیدەی كوڕی قەیسی عینزی بەسری(٠٠٠. ٢٥٢ ك).

١٨ ـ حافز حافز ئەبو عبدالله محمد كوڕی كەثیری ئەلعیبری بەسری(٠٠٠ـ ٢٢٣ ك).

١٩ ـ حافزی زانستیەكان ئەبو بەكر عبداللەی كوڕی محمەدی كوڕی ئەبو شەیبەی ئیبراهیمی كوڕی عوسمانی ئەلعەبسی كوفی(٠٠٠. ٢٣٥ ك ).

٢٠ ـ حافز ئەبولعەبباس حەیاتی كوڕی شەرحی كوڕی یەزیدی حەزرەمی حیمسی (٠٠٠ ـ ٢٢٤ ك ).

ئەمە جگە لە دەیانی تری نزیكی، كە كاریگەرییان لەسەر دینداریی و كەسایەتی و زانایەتیەكەی هەبوە، وەكو سولەیمانی كوڕی حەرب و، ئەبو عەمری حەوزی و، ئەبول وەلیدی تەیالیسی...

منتدى إقرأ الثقافي

## قوتابیانی ئیمام ئەبو داود:

لە دەرسی ئیمام ئەبو داوددا جاری وا هەبوە، دەیان هەزار کەس کۆبونەتەوە، بە تایبەتی، کە زانیاریەکانی حەدیسی راڤە دەکرد، بۆیە زۆر زەحمەت بوە بە لای ئەو کەسانەوە، کە مێژوی ژیانی ئەم پێشەوا بەرێزەیان نوسیوەتەوە بەوردی بڵێن چەند خوێندکاری هەبوە، چ جای ئەوەی بیانناسن! ئیمام زەهەبی دەڵێ: هەر ئەوەندە بەسە بۆ شانازی ئیمام ئەبو داود کە هەردو ئیمام ترمزی و نەسائی قوتابی ئەون، ئەوەندەش بەسە بۆ شایەتی فەزڵ و گەورەیی ئەو، کە ئیمام ئەحمەد بن حەنبەلی بەرێز، کە مامۆستای خۆیەتی، حەدیسی لێوە گێراوەتەوە و لەوەوە نوسیویێتیەوە ..بڕوانە(طبقات الحفاظ ل ٢٦١ و البداية والنهاية ١١/٥٥ و مناقب احمد/ ابن الجوزي ل ٤٥ و تذكرة الحفاظ ل ٥٩٢) .

ئیمام ئیبنو کەثیر دەڵێ: لە قوتابیە هەرە بەناوبانگەکانی ئیمام ئەبو داود: ئەبوبەکر عبداللەی کوڕی خۆی و، نەسائی و، ترمزی و، ئەبوبەکر ئەحمەدی کوڕی سولەیمانی النەجاد و، ئیسماعیلی کوڕی محمدی السەغار و، محمدی کوڕی موخەلەدی دوری و، ئەحمەدی کوڕی محمدی کوڕی هارون الخەلال...

## تەقواو دینداریی

ئەبو حاتەم دەڵێ: ئیمام ئەبو داود لە شەرعناسیو شارەزاییو لەبەرکردن و خواپەرستی و زاهیدێتی و هێزی تەقوایدا، یەکێك بو لە ئیمامەکانی دنیا..

بۆ ناسینەوەی پێشینانی ئەم ئوممەتە سەیری ئەم ریوایەتەکە کە:

ئەبو موسا دەڵێ: ئیمام ئەبو داود ماوەیەکی زۆر لە خزمەتی ئیمام ئەحمەددا فەقێ بو، زۆر پێوەی پابەند بو، بۆیە لە چەندین کەسەوە

منتدى إقرأ الثقافي

بیستۆتەوە، كە دەیانوت ئەبو داود لە ڕەویـەو كەسـایەتی و شێوازی ڕەفتاریـدا، هەر لە ئیمام ئەحمەد دەچێت.. ئیمام ئەحمـەدیش زۆر لـە وەكیعـی مامۆسـتای ئیمام شافیعی دەچو، وەكیعیش زۆر پابەنـدی سـیرەی سـوفیان بـو، سـوفیانیش دەیـانوت دانەیـەكی تـری مەنـسورەو، لـە هـەمو شـتێكیدا بـەو دەچـێت! كەچـی مەنسور لە هەمو ڕەفتاریدا، وەكو ئیبراهیم بـو، ئیـبراهیمیش وەكـو عەلقەمـەو، عەلقەمـەش بـە ئیبنـو مەسـعودەوە پابەنـد بـو.. مێژونوسـانیش لەسـەر ئـەوە كـۆكن، كـە ئیبنـو مەسـعود لـە هـەمو كـەس زیـاتر، لـە پێغەمبـەری خـواﷺ دەچو!!(البداية و النهاية ١١/٥٥ ).

## زانایان ومە تحی ئیمام ئەبو داود

ئیمـام ئـەبو داود كەسـایەتیەكی بـەرزی ئیـسلام و، ئەسـتێرەیەكی گەشـاوەی ئاسمانی هیدایـەتی خواییـە، لـە پاراسـتنی حـەدیس و شـارەزایی شـەرع و، پـەی بردن بە هۆكارەكانی لاوازی حەدیسدا، لە هەموان شارەزاتر بـو، هـەر زانایـەكی ئیـسلام ئـەبو داودی ببینیبێـت، مـەتحی كـردوە، هـەمو دەیـانزانی چ پلەیـەكی بڵندی لە نێو زانایاندا بۆ دیاریكراوە، هەمو ئیعتیرافیان بە گەورەیی و بەڕێزی دەكرد...

- ئەبوبەكر ئەلخەللالی حەنبەلی(٠٠٠- ٣١١ ك) دەڵێ: ئـەبو داود سولەیمانی كوڕی ئەشعەس، پێـشەوای پێـشكەوتوی زەمـانی خـۆی بـو، كـەس لـە سـەردەمی ئـەمودا، ئـەو شـارەزاییەی ئـەوی لـە ناسـینەوەی حەدیـسی سـەحیح و زەعیفـدا نەبو، لە تەقواو دینداریشیدا، كەم وێنە بو. (البداية والنهاية ١١/١٤٨).

- حافز موسای كوڕی هارون دەڵێ: ئەبو داود لە دنیادا بـۆ حـەدیس دروسـت كراوەو، لەو دنیاش بـۆ بەهەشـت، كەسـم لـەو چاكتر نـەدیوە.(تهـذیب التهـذیب ٤/١٧١).

- كە ئیمام ئەبو داود كتێبی(السنَن) ەكـەی خـۆی نوسـی، ئیبراهیمـی حـەربی

منتدى إقرأ الثقافي

گوتی: حەدیس لەبەر دەستی ئەبو داوددا وا نەرم ببو، وەك چۆن ئاسن لەبەر دەستی پێغەمبەر داوددا نەرم بو!(معالم السُنن ١٢/١ و البداية والنهاية ٥٥/١١ ).

ـ الحاكم ئەبو عبدالله دەڵێ: ئەبو داود لەسەر دەمی خۆیدا، پێشەوای بێ موناقیسی حەدیس بو .(تهذيب التهذيب ١٧٢/٤ ).

ـ محمدی کوڕی موخەللەد دەڵێ: ئەبو داودم بینی پێداچونەوەی لەبەر کردنی سەد هەزار حەدیسی خۆی دەکردەوە.. کە کتێبی (السُنَن) ەکەی خۆی نوسی، خەڵکی وەکو قورئان لەدوی بون، گشت زانایانی سەردەمی خۆی، شایەتی شارەزایی و هێزی لەبەرکردنیان بۆ دەدا..(تهذيب التهذيب ١٧١/٤ ).

ـ ئیبنولجەوزی دەڵێ: ئەبو داود شارەزای هۆکارەکانی زەعیفی حەدیس بو، زۆر دەم پاك و زاهید بو، زۆر لە ئەحمەدی کوڕی حەنبەل دەچو .(المنتظم ٩٧/٥ ).

ـ ئیمام زەهەبی دەڵێ: ئەبو داود سەردارێکی حەدیس بو، پێشەوایەکی شەرع بو، کەسایەتیەکی بە سام و هەیبەت بو، خواناس و خاوەن زوهد بو، زۆر لە ئیمام ئەحمەد دەچو .(طبقات الحفاظ ل ٢٦١)

ـ ئیمام نەوەوی دەڵێ: زانایان لەسەر مەتحی ئەبو داود کۆکن، هەمویان وەسفی بە حافزو زاناو وردەکارو، خاوەن تەقواو دینداریی بەهێزو قوڵ تێگەیشتو و، بیرتیژیی ی زانستی فەرمودەوانی دەکەن...

## مەزهەبی ئیمام ئەبو داود

زانایان لە پابەندبونی مەزهەبی ئەم ئیمامە بەرێزەوە، سێ راوبۆچون بون: هەندێکیان گوتویانە سەر بە مەزهەبی شافیعی بوە، هەندێکی تریان گوتویانە حەنبەلی بوە، هەندێکی تریان گوتویانە: هەر خۆی سەر مەزهەبێکی سەربەخۆ بوە.

منتدى إقرأ الثقافي

حاجی خەلیفە(١٠١٧ـ ١٠٦٧ ك) كە توێژەرەوەمیەكی ناوداری كتێب ونوسەرانە دەڵێ: لە بۆچونی ئەبو داوددا، وەرگرتنی حەدیسی زەعیفی بەلاوە پەسەندتر بو، وەك لە راو بۆچونی زانایان، ئەمەش دیدو بۆچونی زۆر زانای تریشە، وەكو ئیمام ئەحمەدی كوڕی حەنبەل، بۆیە هەندێك كەس بە حەنبەلیان ناساندوە، بەلاّم ئەمیش و ترمزیش، بۆ خۆیان سەر بەمەزهەبێكی سەربەخۆ بون، بەلاّم لە مەدرەسەی ئیمام ئەحمەدو ئیمام ئیسحاقدا بون..(كشف الظنون ٢/٢٩٩ ).

ـ شێخ تاهیری جەزائیری دەڵێ: من پێم وایە ئەبو داود و ترمزی هەر وەكو ئیمامەكانی تری حەدیس، وەكو بوخاری پابەندی مەزهەبێكی دیاریكراو نەبون، موقەللیدی هیچ ئیمامێك نەبون، موجتەهیدی گەورەش نەبون، بەلاّم لە ئاستی پێشەواياندا بون و، حەزیان بە ڕاوبۆچونی ئیمامەكانیش كردوە..(توجیە النظر ل ١٨٥).

ـ زانای گەورە شێخ محمد ئەنوەری كەشمیریی دەڵێ: نەسائی و ئەبوداود حەنبەلین، ئیمام ئیبنو تەیمیە باسی مەزهەبەكەیانی كردوە.(فیض الباري ١/٨٥).

## كۆچی دوایی كردنی

ئیمام ئەبو داود لە شازدەی شەوالی ساڵی دوسەدو حەفتاو پێنجی كۆچی، لە بەسرە كۆچی دوایی كرد، ولە تەنیشت گۆڕی سوفیانی سەوریەوە نێژرا، رەحمەتی خوایان لێ بێت...

ئیمام ئیبنو حەجەری عەسقەلانی دەڵێ: ئەبوعوبەیدەی ئەلئاجوری دوای ئەوەی هەمان رۆژی مردنی ئەبو داود دێنێتەوە دەڵێ: وەسێتی كرد، كە ئەلحەسەنی كوڕی ئەلموسەننا بیشوات.

منتدى إقرأ الثقافي

## کتێبەکانی ئیمام ئەبو داود

١ـ المراسيل. ٢ـ الرد على القدرية، يان(الرد علة أهل القدر ).

٣ـ الناسخ و المنسوخ، يان(ناسخ القرآن ومنسوخه )..

٤ـ مسائل إمام أحمد. ٥ ـ كتاب الزهد. ٦ ـ البعث و النشور.٧ـ المسائل التي حلف فيها إمام أحمد. ٨ ـ دلائل النبوة. ٩ـ التفرد في السنن. ١٠ ـ فضائل الانصار.

١١ ـ مسند مالك. ١٢ الدعاء. ١٣ ـ أخبار الخوارج. ١٤ ـ ابتداء الوحي.

١٥ـ نامەیەك لە وەسفی كتێبی(السُنَن ).

١٦ـ وەڵامی پرسیارەكانی ئەبو عوبەید محمدی كوڕی عەلی كوڕی عوسمانی ئەلئاجوری.

١٧ـ كتێبێك لەسەر ناوی ئەو جوتە برایانەی حەدیسی لێیانەوە گێڕاوەتەوە.

١٨ــ پرسیارەكانی ئەحمەد بن حەنبەل لەسەر گێڕەروانانی حەدیس، ئەوانەی جێ متمانەی بون و ئەوانەش، كە پێی لاواز بون.

١٩ـ كتێبە بەناوبانگەكەشی، كە بە(السنن) ناسراوە.

بۆچی كتێبەكەی بە(السنن) ناسراوە؟!

لە زانستی فەرمودەوانیدا، جیاوازی هەیە لە نێوان ناوی سەرچاوەكانی حەدیسدا، ئەلجەوامع جیاوازە لە المەسانید، ئەمانیش لە السونەن، هەموشیان لە ئەلموستەدریكات... هەر یەكەیان پێناسەو سیفاتی خۆی هەیە... بە سەبارەت بە(السُنَن) دوە، بەو كتێبە سەرچاوانەی حەدیس دەوترێت كە بە پێی بابە شەرعیەكانی فیقه ریزبەندی كراون، بۆ نمونە یەكەمین باب: الايمان، ئینجا الطهارة، ئینجا الصلاة... وە هەروەها... ئەمانە هیچ حەدیسێكی مەوقوفی تێدا نیە، چونكە مەوقوف لە زاراوەی فەرمودەواناندا، حەدیسە، بەلام سوننەت نیە..(أصول التخريج ودراسة الأسانيد / الدكتۆر محمود الطحان ل (١٢١)...

منتدى إقرأ الثقافي

## مەتحی زانایان بۆ (السنن)ی ئەبو داود

زۆر لە زانایان و شەرعناسان، مەتحی کتێبی(السُنَن) هکەی ئیمام ئەبو داودیان کردوە، بەڵام ئێمە تەنها ئاماژە بە هەندێکیان دەکەین، چونکە ئێرە جێی زۆر باس لێکردن نیە:

- ئیمام نەوەوی دەڵێ: پێویستە لەسەر ئەو کەسەی دەکەوێتە خوێندنی شەرع و زانستیەکانی تر، کتێبی (السنن) ی ئەبو داود لەبەرچاو بگرێت و، باش لێی شارەزا ببێت، چونکە ژمارەیەکی زۆر لە حەدیس بە بەڵگە دەهێنێتەوە، کە بە شێوەیەکی کورت و ئاسان دەیانخاتە بەر دەست، کە زیرەکی و وردەکاریی و بایەخپێدانی زۆری ئەبو داود، بە حەدیس نیشان دەدات..(مقدمة بذل المجهود ).

- ئەلخەتتابی دەڵێ: گوێم لێبو ئیبنول ئەعرابی(ئاماژەی بۆ کتێبی السنن کرد) و لە مەتحیدا گوتی: هەر کەسێك قورئانەکەی خواو، ئەم کتێبەی ئەبو داودی پێ بێت، ئیتر پێویستی بە زانیاری کەسی تر نابێت..(معالم السنن ٨/١ و مفتاح دار السعادة ل ١٠ ).

- زەکەرییا ئەسساجی دەڵێ: کتێبەکەی خوای گەورە ئەسڵی ئیسلامەتیە، کتێبەکەی ئەبو داودیش، پەیماننامەی ئیسلامەکەیە.. (تذكرة الحفاظ ١٦٩/٢ و طبقات الشافعية الكبرى ٣٩٥/٢ ).

- زانای مەزن ئیمام ئیبنولقەییم دەرشەقی دەڵێ: کتێبی (السنن) هکەی ئەبو داودی کوڕی ئەشعەسی سەجستانی(رحمه الله)، لایەقی ئەو شوێنەیە، کە خوای گەورە بۆی داناوە. کە کردویتیە داوەری چارەسەری ناوخۆیی و، کێشەی نێوان موسوڵمانان، ئەو، بابەتەکانی ئەو کتێبەی لەگەڵ باش هەڵبژاردنیدا، زۆر جوان ڕیز کردوە، حەدیسەکانی هەڵاوێردوە، گێڕانەوەی فەرمودەوانە لاوازەکان و،

منتدى إقرأ الثقافي

ئەوانەی لێیان وەرنەگیراوە، دیاری کردوەو خستۆتە لاوە..(تهذيب السنن / ابن القيم ٨/١ و تهذيب التهذيب ١٧١/٤ )..

ـ ئیمام ئەبو داود خۆی لەو نامەیەیدا، کە بۆ خەڵکی مەککەی نوسیوە، وا وەسفی کتێبی (السنن) ەکەی کردوە: ئەمە کتێبێکە، هیچ سوننەتێکی پێغەمبەرﷺ لێ گل ناداتەوە(هەمو سوننەتەکانی تێدایە)، وا نازانم خەڵکی لە دوای قورئان، بە هیچ کتێبێکەوە وەك لەم کتێبە پابەند بکرێن، ئەوی ئەم کتێبەی هەبێت وا نازانم زانستی تری وای لەدەست بچێت، هەر کەس ورد سەرنجی بداتێ و لێی حاڵی ببێت، قەدری دەزانێت...

## پلەو ئاستی (سنن)ی ئەبو داود لە نێوان سیحاحی ستتەدا

زۆر لە زانایانی ئیسلام لەسەر ئەوەن، کە سەرچاوەکانی حەدیس، لە ڕوی ڕاستی حەدیسەکانیانەوە، سونەنی ئەبو داود، یەکسەر لە دوای سەحیحی بوخاری و سەحیحی موسلیم دێت...

ـ ئیمام ئیبنول قەییم جەخت لەمە دەکاتەوەو دەڵێ: ئەوە بزانە، کە سەرۆك و پێشەوای ئەوانە (فەرمودەوانان)، مالیك و ئەبو عبدالله محمدی کوڕی ئیسماعیلی بوخاریە، کتێبەکەی ئەوان یەکەمن (مەبەستی (مُوَطأ)ی ئیمام مالیك و سەحیحی بوخاریە) ئینجا سەحیحی موسلیم دێت، ئینجا بە دوایاندا سونەنی ئەبو داود، دوای ئەوان ئەبو عیسای ترمزی وکتێبەکەیەتی، پاشان ئەبو عبدالرحمانی نەسائی... ئەمەش راوبۆچونی خاوەنی کتێبی (نيل الأماني) يشه. (مفتاح دار السعادة ل ١١).

ـ سیوتی دەڵێ: زەهەبی گوتویەتی: کتێبی(جامع) ەکەی ترمزی، لەبەر ئەوەی لە سەنەدی(گێڕەرەوەی حەدیسەکە) هەندێك حەدیسدا المصلوب و الكلبي تێدایە(کە دو کەسی لاوازی حەدیس گێڕانەوەن )، پلەی کەوتۆتە دوای کتێبی(السنن) ی ئەبو داودەوە.(تدريب الراوي ١٧١/١).

منتدى إقرأ الثقافي

ـ شێخ عبدالعەزیزیش هەر ئاماژە بەوە دەكات، كە لە هەردو كتێبی (البستان)و (العجالة)دا دەڵێ: سەرچاوەكانی شەش كتێبی حەدیس(كە بە سوحاحی ستتە ناسراون) بەم ڕیزەن: بوخاری، موسلیم، ئەبو داود، ترمزی، نەسائی، ئیبنو ماجە... ئیمام نەوەویش هەر بەم ڕیزبەندییە ناساندونی...(المقدمة و الدراري ل ١٣٩ ـ ١٤٠).

## ژمارەی حەدیسەكانی سونەنی ئەبو داود

ئەبوداود لەو نامەیەیدا، كە دەربارەی كتێبی السونەنی خۆی بۆ خەڵكی مەككەی نوسیوە، دەڵێ: لە پێغەمبەری خواوەﷺ پێنج سەد هەزار حەدیسم نوسیوە، ئەوی لەم كتێبەمدا نوسیومن، چوار هەزارو هەشت سەد حەدیسە، نزیكەی شەش سەد مورسەلیشی تێدایە[١].

سیوتی دەڵێ: ژمارەی حەدیسەكانی سونەنی ئەبو داود، چوار هەزارو هەشت سەد حەدیسە، ئەبو داود بەبەشی كردون بۆ(كتاب)، هەر كتابێكیشی كردۆتەوە بەچەندین(باب)[٢].ژمارەی هەمو كتابەكانی سوننەنی ئەبوداود(٣٥ سیو پێنج كتاب)ن، كە سیانیانی ناونوس نەكردوە،(ناونیشان یان سەردێڕی بۆ دانەناون)و، ژمارەی بابەكانیشی(١٨٧١هەزارو هەشت سەدو حەفتاو یەك باب)ن.

ـ حافزی زەهەبی دەڵێ: لە كتێبەكەی خۆیدا(سير أعلام النبلاء) دا دەڵێ: حەدیسەكانی سونەنی ئەبو داود، شەش جۆرن:

١ـ بەهێزترین حەدیس: ئەوانەن، كە لە بوخاری و موسلیمیشدا هەن، ئەمانەش نزیكەی نیوەی كتێبەكەن...

---

١ ئەوی لە سەنەدەكەیدا(گێڕەرەوەی حەدیسەكە) ئەو سەحابییەی ناو نەبراوە، كە راستەوخۆ لە پێغەمبەرەوەﷺ گێڕاوەتەوە.

٢ زانایانی ئیسلام بەگشتی و، فەرمودەوانان و شەرعناسان بە تایبەتی، كتێبەكانی خۆیان دەكرد بە بەشی ئاواوە. بۆ نمونە:(كتاب) وەكو كۆبەندی زەمانی ئێمە بو، ئینجا(باب )، كە وەكو بەندو بەشی زەمانی ئێمە، بابەكانیشیان دەكردەوە بە(مسألة) بۆ نمونە :(كتاب الطهارة /باب المياه: مسألة الماء المستعمل) وە هەروەها...

منتدى إقرأ الثقافي

٢ـ ئینجا ئەو حەدیسانەن، کە بوخاری، یان موسلیمیش گێڕاویێتیەوە.

٣ـ دوای ئەم، ئەو حەدیسانەن، کە سەنەدەکانیان(گێڕەرەوەی حەدیسەکە)، هیچ ئیشکالێکیان لە ڕوی لاوازی و نامۆییەوە تێدا نیە.

٤ـ دوای ئەمیش ئەو حەدیسانەن، کە هەندێك لە زانایان قسەیان لەسەر سەنەدیان (گێڕەرەوەی حەدیسەکە )، یان دەقەکانیان کردوە بەڵام لای هەموانیش هەر مەقبول بون.

٥ـ ئینجا ئەو حەدیسانەن، کە سەنەدەکانیان(گێڕەرەوەی حەدیسەکە )، باس لە لاوازیی ریوایەتیان کراوە، زۆرجار ئەبو داود بۆ خۆشی لەم حەدیسانە بێ دەنگ بوە.

٦ـ پاشان ئەو حەدیسانەی کە لای هەندێك لە زانایان بە هۆی کەسێکی سەنەدەکەوە(گێڕەرەوەی حەدیسەکە )، حەدیسەکە بە زەعیف ناسێنراوە، ئەبو داود بۆ خۆشی قسەی لەسەر ئەمانە کردون و، کەمجار هەیە لێیان بێ دەنگ بوبێت، مەگەر لەبەر زۆر بەناوبانگی حەدیسەکە..

## شەرحەکانی سونەنی ئەبو داود

وەکو هەر کتێبێکی تری سەرچاوەی حەدیسی پێغەمبەرﷺ، حەتمەن سونەنی ئەبو داودیش(رحمه الله) زۆر شەرح کراوە، بیست لەو شەرحانە:

١ـ معالم السنن: نوسینی سلیمانی کوری ئیبراهیم الخطابي(٠٠٠ـ ٣٨٨ ك).

٢ـ عجالة العالم من كتاب المعالم: الحافظ شهاب الدين احمد(٠٠٠ـ ٧٦٥ ك).

٣ـ العد المودود في حواشي سنن أبي داود: الحافظ المنذري(٠٠٠ـ ٦٥٦ ك).

٤ـ(شرح مختصر سنن أبي داود) الامام المنذري(٠٠٠ ـ ٦٥٦ ك).

٥ ـ تهذيب ابن القيم محمدی ابوبکری کوری ایوب الزرعي الدمشقي(٠٠٠ ـ ٧٥١ ك).

٦ ـ شرح السنن: شهاب الدين احمدی کوری روسلان الرملي(٠٠٠ـ ٨٤٤ ك).

٧ـ شرح السنن: قطب الدين أبوبکری کوری دعسین الیمني الشافعي(٠٠٠ـ ٧٥٢ك).

منتدى إقرأ الثقافي

٨ ـ شرح السنن: الحافظ موغلطاى كورِى قليج(٠٠٠ـ ٧٦٢ ك).

٩ـ شرح شهاب الدين ابو محمدى كورى محمد المقدسي(٠٠٠ـ ٧٦٥ ك).

١٠ ـ شرح عمرى كورى روسلانى كورى البەلقيني(٠٠٠ ـ ٨٠٥ ك).

١١ـ شرح أبي زرعة العراقى احمدى كورى عبدالرحيم(٠٠٠ـ ٨٢٦ ك).

١٢ـ شەرحى بەشێكى: محمدى كورى احمد العيني الحنفي(٠٠٠ـ ٨٥٥ ك).

١٣ـ شرح الحافظ السيوطى(٠٠٠ـ ٩١١ ك) كه به ناوى(مرقاة الصعود الى سنن أبي داود) ە.

١٤ـ شرح ابي الحسن محمدى كورى عبدالهادة السندى(٠٠٠ـ ١١٣٨ ك) كه به ناوى(فتح الودود على سنن أبي داود) ە.

١٥ـ(الهدى المحمود فى ترجمة سنن أبي داود): مولوي وحيد الزمان الكهنؤي(٠٠٠ـ ١٣٩٦ ك) كه به زمانى ئوردو نوسراوە.

١٦ـ(غاية المقصود في حل أبي داود): الشيخ العلامة شمس الحق ابي الطيب العظيم آبادي(٠٠٠ـ ١٣٢٩ ك).

١٧ـ(عون المعبود شرح سنن أبي داود): محمد أشرف العظيم آبادي، كورت كراوه ى(غاية المعبود في شرح سنن أبي داود) ە.

١٨ـ(المنهل العذب المورود شرح سنن الإمام أبي داود) الشيخ محمود محمد خطاب السبكي(٠٠٠ـ ١٣٥٢ ك) تا(باب الهدي من مناسك الحج) هاتبو، دواتر شيخ امينى كورى تە واوى كردو ناوى نا:-(فتح الملك المعبود تكملة منهل العذب المورود شرح سنن أبي داود).

١٩ـ(بذل المجهود في حل سنن أبي داود) العلامة المحدث الشيخ خليل احمد السهارنفوري(٠٠٠ـ ١٣٤٦ ك) باشترين شەرحى سونەنى ئەبوداودە.

٢٠ـ(عون المعبود في شرح سنن أبي داود): عبدالرحمن الساعاتي(باوكى ئيمام حسن البناى ئيخوانە ﷺ).

منتدى إقرأ الثقافي

# نمونەیەك لە سونەنی ئیمام ئەبو داود

**كتاب الحدود**

**باب المرتد**

**قال الامام ابو داودﷺ تعالى:**

**حدثنا عمرو بن عون، انا معاوية، عن الأعمش، عن عبدالله بن مرة، عن مسروق، عن عبدالله قال:** قال رسول الله ﷺ (لا يحل دم رجل مسلم يشهد أن لا إله إلا الله وأني رسول الله إلا بإحدى ثلاث: الثيب الزاني، والنفس بالنفس، والتارك لدينه المفارق للجماعة)[١].

**انا: كورت كراوەی(حدثنا) یە واتە قسەی بۆ كردین، یان بۆی گێڕاینەوە.**

**عن: یەعنی لەو كەسەوە گێڕراوەتەوە.**

**ڕەحمەتی خوا لە ئیمام ئەبو داودو، سەرجەم یاوەران و زانایان و شەرعناسانی ئیسلام، كە هەمویان خاوەن چاكەن لەسەر نەوەكانی دوای خۆیان، كە ئەو دینەیان بەو تەڕو،بەلیەی خۆی پاراست و بە ئێمەشیان گەیاند...**

---

**١ بوخاری لە سەحیحەكەی خۆیدا (ژمارە ١٧٦/١٢) لە باب الدیات/باب قول الله تعالى (النفس بالنفس والعین بالعین) هێناویەتیەوە. موسلیمیش لە القسامة/باب ما یباح بە دم امرئ مسلم إلا باحدى ثلاث ژمارە(١٦٧٦ )، نەسائیش لە تحریم الدم/باب ذكر ما یحل بە دم المسلم(٩٠/٧، ٩١) دا هێناویەتیەوە..**

منتدى إقرأ الثقافي

# ئیمام ترمزی ( رحمه الله )

( ٢٠٩ ـ ٢٧٩ ك )

## ناو و ڕەچەڵەکی

ـ ئەبو عیسا محمدی کوڕی عیسای کوڕی سیوەرەی کوڕی موسای کوڕی زەححاکی سەلەمی بورغی ترمزی ئەلغەریرە.(تهذیب التهذیب ٣٨٧/٩ و مقدمة الجامع الصحیح / احمد محمد شاکر ٧٧/١ و شذرات الذهب في أخبار من ذهب ١٧٤/٢).

ـ لە نەسەبیدا دو قەولی تر هەیە، یەکەمیان: (محمدی کوڕی عیسای کوڕی سیوەرەی کوڕی شەدداد) و، دوەمیان: (محمدی کوڕی عیسای کوڕی یەزیدی کوڕی سیوەرەی کوڕی ئەسسەکەن). (مقدمة الجامع الصحیح ٧٧/١). بەڵام قەولی یەکەم ریوایاتی زیاتری لەسەرەو، زۆرینەی زانایان، بە تایبەتی پێشەوایانی پیاوناسیی بە ڕاستریان داناوە...

## شوێنی لەدایکبون و گەشەی

ـ ئیمام ترمزی ڕەحمەتی خوای لێ بێت، وەکو شێخ محمد عابدی سندی، نوسیوێتی لە ساڵی ٢٠٩ ك لەدایکبوە، زۆر گەڕام بەدوای سەرچاوەیەکدا ئەمەم بۆ ساغ کاتەوە، دەستم نەکەوت. بەڵام ئیمام زەهەبی ڕەحمەتی لێ بێت، لە کتێبی(میزان الاعتدال في نقد الرجال ٦٧٨/٢)ەکەیدا نوسیوێتی، ترمزی لە ساڵی ٢٧٩ دا کۆچی دوایی کرد، کە لە تەمەن حەفتاکان بو...) جا لەوانەی شێخی سندیش ئیعتیمادی کردبێتە سەر، حاڵیبونێکی ئاوا... والله اعلم.

ـ زانای پایەبەرز عەللامە عەلی القاری، لە ڕاڤەی کتێبی(الشمائل)ی ترمزیدا

منتدى إقرأ الثقافي

دەڵێ: (لەساڵی ٢٧٩ دا لە تەمەنی حەفتا ساڵیدا کۆچی دوایی کردوه).

ـ لە گوندی(بوغ) لەدایکبوه، کە سەر بە شارۆچکەی ترمز بوه، کە دەکەوێتە ئەفغانستانی ئەمڕۆوە.. ئیمام سەمعانی دەڵێ ترمزی لە گوندی بوغ لەدایکبوەو، هەر لەوێش کۆچی دوایی کردوه..

## زانایان و مه تحی ترمزی

ـ ئیبنو حیببانی حافیز لە کتێبی(الثقات) دەربارەی ترمزی دەڵێ: ئەبو عیسا لەوکەسانەیە، کە زانستییان کۆکردۆتەوەو لەبەریان کردوەو پاراستویانەو، کتێبیان لەسەر نوسیوە (تهذیب التهذیب ٣٨٨/٩، البداية و النهاية ٦٧/١١، تذكرة الحفاظ / الذهبي ٦٢٤/٢).

ـ ئەبو ئەسعەدی ئیدریسی دەرهەقی دەیفەرمو: ئەبو عیسا لە توانای زۆر لەبەر کردندا نمونەی پێ دەهێنرایەوە، ئەو یەکێکە لەو زانایانەی فەرموده‌وانی کە ئیقتیدایان پێ دەکرێت. (تذكرة الحفاظ/ الذهبي ٦٢٤/٢، مقدمة صحيح الجامع(سنن الترمذي) ٨٤/١).

ـ حاکمی نەیسابوری(ئەمە قوتابیەکەی خودی ترمزی نیە، کە هەر ناوی حاکمەو خاوەنی کتێبی موستەدریکە، کە یەکێك بو لەو زانا فەرمودەوانانەی، نیو ملیۆن فەرمودەیان لەبەر بوە!) دەربارەی ترمزی دەڵێ: گوێم لێبو عومەری کوڕی عەلەك دەربارەی ترمزی دەگوت: (بوخاری کۆچی دوایی کرد، لە زانست و لەبەر کردن و تەقواو خواناسییدا، کەسی وەکو ئەبو عیسای لە خۆراسان بەجێ نەهێشتوە، ئەوەندە دەگریا تا کوێرایی داهات، چەندین ساڵ بە کوێری مایەو، تا کۆچی دوایی کرد!

ـ خەلیلی دەربارەی دەڵێ: ئەبو عیسا جێ متمانە بو، هەمو زانایان لەسەری رێك بون.. (تهذيب التهذيب ٣٨٨/٩).

منتدى إقرأ الثقافي

- ئیمام موززی لە كتێبی(التهذیب) ەكەیدا وا وەسفی دەكات: حافزی گەورە، خاوەنی كتێبی (الجامع) و كتێبی دیكە، یەكێكە لە پێشەوایانی لەبەر كردن و پاراستنی فەرمودە، خوای گەورە كردی بە مایەی سودمەندی موسوڵمانان، (مقدمة الجامع الصحیح ٨٤/١ ).

- ئیمام زەهەبی لە كتێبی(المیزان) ەكەیدا دەربارەی دەڵێ: حافزی مەزن، خاوەنی كتێبی (الجامع)، ئەوی هەمو زانایان لەسەری رێكەوتبون، كە جێمتمانەیە

لا ناكرێت بەلای ئەو قسەیەوە، كە ئیبنو حەزم دەرهەقی گوتویەتی: مەجهولە! چونكە دیارە، كە ئیبنو حەزم نە ناسیویێتی و نە زانیویشێتی، كە كتێبی (الجامع)ی هەیە، وا نازانم هەنجەتی بۆ ئەو قسەیەی هەبێت (مقدمة الجامع الصحیح ٨٤/١ ).

- سەمعانی لە كتێبی(الانساب/ ورقة ٩٥) ەكەیدا دەربارەی گوتویەتی: ئیمام بێ مونافیسی زەمانی خۆی بو، خاوەنی چەندین كتێبە، یەكێكە لەو فەرمودەوانانەی ئیقتیدایان پێ دەكرێت.

- زانای گەورە، تاش كوبرازادە(ئەحمەدی كوڕی موستەفا كە لە ٩٦٢ ك كۆچی دوایی كردوە )دەربارەی ترمزی دەڵێ: یەكێكە لە زانا شارەزاكانی فەرمودە، كە زۆر دیار بوە، لە شەرعناسیی(فیقه) دا دەستێكی باڵای هەبوە، فەرمودەی لە كۆمەڵێك زانای پۆلی یەكەمی فەرمودەوانیەوە وەرگرتوە.(مفتاح دار السعادة ).

- ئیبنو عیمادی حەنبەلی دەربارەی گوتویەتی: پێشەوای زانایان بو، لە لەبەر كردن و وردەكارییدا موعجیزەیەك بو.(شذرات الذهب ١٧٤/٢).

- ئیبنو خەلەكان لە(وفیات الاعیان ٢٧٨/٤) دا دەربارەی ترمزی گوتویەتی: یەكێكە لە زانایانی فەرمودە، كە ئیقتیدای پێ دەكرێت.

منتدى إقرأ الثقافي

ـ ئیمام ئیبنو حەجەری عەسقەلانی دەڵێ: ئەبو فەزڵی بەیلەمانی دەربارەی ترمزی فەرمویەتی: لە نەسری کوڕی محمدی شێرکۆییم بیستوە/ کە دەیگوت: گوێم لێبو محمدی کوڕی عیسا دەیگوت: محمدی کوڕی ئیسماعیل(یەعنی ئیمام بوخاری) پێی دەگوتم: من زیاترم سود لە تۆ کردوە، وەك لەو سودەی تۆ لەمن کردبێتت! (تهذیب التهذیب ٣٨٩/٩).

## پێگەیشتن و توانای لەبەر کردنی

ـ ئەبو عیسا محمدی کوڕی عیسای ترمزی، پیاوێکی شارەزاو زانایەکی لەخواترس بو، بۆ توانای زۆر لەبەر کردن، نمونە بەم دەهێنرایەوە، ئیبنو حەجەری عەسقەلانی رەحمەتی خوای لێ بێت، لە ئیدریسییەوە نەقڵ دەکات، دەڵێ: گوێم لە شەرعناس ئەبوبەکری کوڕی ئەحمەدی کوڕی الحارسی مروزی بو، گوتی: گوێم لە ئەحمەدی کوڕی عبداللەی کوڕی داود بو، دەیگوت: گوێم لە ئەبو عیسای ترمزی بو، کە دەیگوت: بەرەو مەککە کەوتبومە ڕێ، دو بەشم لە کتێبی نوێی فەرمودەی شێخێك نوسیبو، لە ڕێگا هەواڵیان دامێ، کە ئەو شێخە بەڕێزە لەسەر ڕێمانە زۆرم پێخۆشبو، چومە خزمەتی و هەر وام دەزانی، کە دوبەشی ئەو فەرمودانەم پێیە، کە لەوەوەم وەر گرتوە، تومەز دو بەشی دیکەی کتێبێکن، کە وەکو ئەو کتێبانە بون، کە فەرمودەکانی ئەمم تێدا نوسیبونەوە! بە پەلە خۆم گەیاندێ و عەرزم کرد، ئەوە ئەو فەرمودانەن، کە لە بەڕێزتانەوەم وەرگرتوە، دامێ و سەیری کرد، بە سەرسامیەوە دیقەتی دامێ و گوتی: شەرم ناکەیت؟ فەرمودانێکت لە منەوە وەرنەگرتەوەو بە منی دەڵێیتەوە!! زانیم: کە هەڵەم لە هێنانی کتێبەکاندا کردوە، خێرا پێم وت: ئەوانەی جەنابتانم لەبەر کردوە، وەك بیەوێت بە راستم نەناسێت، سەیرێکی لەپی دەستی کردم، پاکەو هیچی لێ نەنوسراوە، ئیتر دەسبەجێ سەرەتای فەرمودەیەکی پێ وتم و، گوتی: تەواویکە... خێرا بۆم تەواو کرد،

منتدى إقرأ الثقافي

فەرمودەیەکی دیکەی پرسی و تەواوم کرد، فەرمودەی قورستری پرسی و تەواوم کرد، ئاوا هەرچی لێ پرسیم و هەر هەمویم بە خێرایی بۆ وتەوە! ئینجا لەو دو کتێبەی خۆمی لێ پرسیم، هەرچی لێ پرسیم وەڵامم دایەوە، گوتی: پێش ئەوەی بێیتە لام لەبەرت کردبو ؟ وتم: نەخێر قوربان.. دەتوانیت هی ترم لێ بپرسیت، ئینجا چل فەرمودەی تری دور لەیەکی لێ پرسیم، هەمویم زانی! سەری سوڕما! ئیتر باسی هێنانی دو کتێبەکەم بۆ گێڕایەوە، فەرمویی: کەسم وەکو تۆ لە توانای لەبەر کردندا نەدیوە..

## گەشت و گەڕانی

حافزی ترمزی لەبەر ئەوەی یەکێك بوە لە پێشەوایانی فەرمودەوانی سەردەمی خۆی و، وەکو هەر یەکێکی دیکە لە زانایان و شەیدایانی زانستی شەرعی، هەر لەدوای فێربون دەگەڕاو دەیویست زیاتر فێرببێت، بەسەر ناوچەو زانای زۆردا گەڕا، لە خۆراسان و عێراق و حیجاز..(مقدمة الجامع الصحیح ١/٨٣ ).

ـ شێخ ئەحمەد شاکری گەورە توێژەرەوەی میسری، کە پێشەکی کتێبەکەی ترمزی نوسیوە، دەڵێ: وا نازانم چوبێتە بەغدا، چونکە ئەگەر بچوایەتە ئەوێ، حەتمەن ئیمام ئەحمەدی کوڕی حەنبەل(١٦٤ـ ٢٤١ك)، پێشەوای مەزنی فەرمودەوانانی دەبینی، بە دڵنیاییەوە حافز ئەبوبەکری خەتیبی بەغدادیش، مێژوی ژیانی لە کتێبەکەیدا(تاریخ بغداد) دا دەنوسیەوە.. (مقدمة الجامع الصحیح ١/٨٣).

## ماموٚستاکانی ئیمام ترمزی:

سەردەمی ئیمام ترمزی، سەردەمی ڕاپەڕینی زانستی بو، سەردەمی گەڕان لە دوی فەرمودەو، کۆکردنەوەو تۆمارکردنی بو، ئیمام ترمزی لە گەیشتن بە

منتدى إقرأ الثقافي

خزمەتی زانایانی ئەو سەردەمەی، درێغی نەکرد، تا بۆی لوا کەمتەرخەمی نەکرد، بۆیە هەندێك زانایان گوتویانە/مامۆستاکانی ئەوەندە زۆر بون، مەگەر هەر خۆی هەژماردیان کات! بەلاَم لە هەموان بەناوبانگترو کاریگەرتر:

- سوەیدی کوڕی نەسری کوڕی سوەیدی مروزی(١٤٩ ـ ٢٤٠ ك ٩١) سالاَن بو!
- قوتەیبەی کوڕی سەعیدی سەقەفی ئەبو رەجاو(١٥٠ ـ ٢٤٠ ك)٩٠ سالاَن بو)!
- ئەبو موسعەب ئەحمەدی کوڕی ئەبو بەکری زوهری مەدەنی(ـ ٢٤٢:).
- عبداللەی کوڕی معاویەی جومەحی(ـ ٢٤٣) تەمەنی لە١٠٠ سالاَن تێپەڕیبو.
- عەلی کوڕی حیجری مروزی(ـ ٢٤٤) ئەویش نزیکەی١٠٠ سالاَن بو).
- ئیبراهیمی کوڕی عبداللەی کوڕی حاتەمی هورەوی(ـ ٢٤٤ ك).
- محمدی کوڕی عبدالمەلیکی کوڕی ئەبو شوارب(ـ ٢٤٥ ك).

- جگە لەمانیش وەکو وتمان، مامۆستایانی ئیمام ترمزی هەر زۆر زۆرن.. ئەوەندەی بەسە، کە شارەزایی فەرمودەوانیەکەی لە ئیمام بوخاری وەرگرتوە! لای ئەو فێری ئەم زانستیە پیرۆزە بوە، ئەو مەشقی پێکردوەو هەر لای ئەو فێری موناقەشەی زانایان بوەو، نەشبوە بە شوێنکەوتوی ئیمام بوخاری! زۆر جاریش لەگەلّ یەکتریدا، مونازەرەیان لەسەر ڕاستی سەنەدی فەرمودە کردوە!

## فەقێکانی ئیمام ترمزی

دیسان ئەوانەی لە ئیمام ترمزییەوە زانستەکان، بە تایبەتی فەرمودەوانی فێربون، زۆر زۆرن، مێژوی ژیانی زۆرینەیان وا لە کتێبەکانی (تذکرة الحفاظ/الذهبي ٦٢٤/٢) و. (تهذیب التهذیب/ابن حجر العسقلاني٣٨٧/٩)، بەناوبانگرتینیان کە شێخ ئەحمەد شاکر ڕیزبەندی کردون و، پێشتریش محمدی کوڕی مەحبوب ئەبولعەبباسی ئەلمەحبوبی مروزی، کە گێڕەرەوەو حافزی هەمو فەرمودەکانی کتێبی(الجامع) ەکەی ئیمام ترمزیە، باسی لێوە کردون.. لەوانە: ئەبو حامد

منتدى إقرأ الثقافي

ئەحمەدی کوڕی عبداللەی کوڕی داودی مروزی بازرگان و، هەیسەمی کوڕی کولەیبی شامی و، ئەحمەدی کوڕی یوسفی نەسەفی و، ئەبولحارس ئەسەدی کوڕی حەمدەوەی و، داودی کوری نەسری کوڕی سەهلی بەزدەوی و، وەعیدی کوڕی محمدی کوری مەحمودی نەسەفی و، مەحمودی کوڕی نومەیرو محمدی کوڕی و مەحمودی کوڕی مەککی کوڕی فەوج و، ئەبو جەعفەر محمدی کوڕی سوفیانی کوڕی نەزری نەسەفی و، محمدی کوڕی مونزیری کوڕی سەعیدی هورەوی و دەیانی دیکە..

## کتێبەکانی ئیمام ترمزی:

ئیمام ترمزی وەکو زانایان لە باسی ژیانیدا نوسیویانە (صاحب التصانیف)، واتە خاوەنی کتێبی زۆرە! بەڵام وا دیارە بەشێکی زۆری فەوتاوەو، هەر وەکو هەزاران کتێبی دیکەی زانستیە شەرعیەکان بە داخەوە بە نەوەی ئێمە نەگەیشتوە.. لەو کتێبە بەناوبانگانەی ئیمام ترمزی کە زانایانی باسیان لێوە کردوە:

١ـ الجامع الصحیح، کە بە(سنن الترمذي) بەناوبانگە.

٢ـ الشمائل النبویة بە(شمائل الترمذي) ناسراوە.

٣ـ العلل. ئەمە کتێبێکی سەربەخۆیە، نەك ئەو بەشە بێت، کە لە کۆتایی سننەکەیدا بە ناوی العللەوە هەیە..

٤ـ العلل المفرد، کە بە(العلل الکبیر) یش ناسراوە.

٥ـ التاریخ(ئیبنونەدیم لە کتێبی(الفهرست)ەکەی خۆیدا باسی کردوە.

٦ـ الزهد(المفرد) کە ئیمام ئیبنو حەجەری عەسقەلانی دەربارەی دەفەرموێ: بەرچاومان نەکەوتوە. (تهذیب التهذیب ٣٨٩/٩).

٧ـ الاسماء والکُنی.

٨ـ کتێبێك بە ناوی(في الاثار الموقوفة) کُە ئیمام ترمزی خۆی لە کۆتایی

منتدى إقرأ الثقافي

کتێبی السننەکەیدا ئاماژەی پێکردوە.

٩ـ اسماء الصحابة. ئیبنو کثیر ئاماژەی پێکردوە (البداية و النهاية ٦/١١).

## باسێك لەسەر الصحيح الجامع( سنن الترمذي )

ــ ئـەبو عـەلی مەنـسوری کـوڕی عبداللـەی الخالیـدی، لـە ترمزییـەوە دەگێڕێتـەوە، کـە دەربـارەی کـتێبی الجامعەکـەی دەیگـوت: ئـەم کتێبـەم دانـا، نیشانی زانایانی فەرمودەوانیانی حیجازو عێـراق و خۆراسـانمدا، هەمویان لێـی ڕازی بون، هـەیانبو دەیگوت: هـەر کەسـێك ئـەم کتێبـەی لـە ماڵدا بێـت، وەك ئەوەیە، کە پێغەمبـەرێکی لەماڵدا بێـت و قـسەی بـۆ بکـات !! (تـذکرة الحفـاظ / الذهبي ٦٢٤/٢، تهذيب التهذيب ٣٨٩/٩).

ـ عەللامە تاش کوبرا زادەه دەربـارەی خـۆی و کتێبەکـەی لـە کتـێبی (مفتـاح دار السعادة) دا دەیگوت: تـرمزی کتێبی زۆرن، بە تایبـەتی لەسـەر فـەرمودەوانی، کتێبی الجامعەکەی لە باشترین کتێبی فەرمودەیەو، لـە هـەموان سـودی زیـاترە، ڕیزبەندیەکـەی ڕێکوپێکـەو دوپاتبونـەوەی کەمـە، ئـەوی لەوێـدا هەیـە، لـە کتێبەکانی تری فەرمودەدا نیە، چونکە لەمدا ڕاڤەی خـۆی و بـەراورد کـردن و شـیکاری سـەنەدو، دیـاریکردنی سـەحیح و حەسـەن و لاوازی، تێـدا رون کراوەتەوەو، ئەحکامی شەرعیشی تێدایە، لەسەرو ئەمانەشەوە زانستی جەرح و تەعدیل(پیاوناسیی) تێدایە، لـە کۆتـایی کتێبەکەشـدا بەشـی(العلل)، هەیـە کـە سودێکی زۆری لە خۆگرتوە، هەر کەسێك بینیبێتی، دەزانێت چ کارێکی گەورەو بە نـرخە...

ـ ئیمام ئەبو ئیسماعیل عبداللەی کوڕی محمدی ئەنساری هورەوی، کە باسـی الـسننەکەی ئیمـام تـرمـزی دەکـات دەربـارەی دەڵـێ: ئـەم کتێبـەی ترمـزیم لـە کتێبەکانی بوخاری و موسلیم پێ باشترە، چونکە سودی بوخاری و موسـلیم بـۆ کەسانێکە، کە خۆیـان بـە قـوڵایی زانـستی شـەرعدا ڕۆچوبن، بـەڵام کتێبەکـەی

منتدى إقرأ الثقافي

ئـەبو عیـسا، هـەمو کەسـێك لـەو خەڵکـەش دەیگـەنێ و، سـودی خۆیـانی لـێ دەبینن..

ـ ئەبوبـەکری ئیبنولعـەرەبی لـە سـەرەتای شـەرحی[1] ئـەم کتێبـەی ترمزیـدا دەڵـێ: بـزانن ـ خـوا دڵ و دەرونتـان پـڕ کـات لـە نـور ـ کـە کتێبەکـەی الجـەعفی(مەبەسـتی ئیمـام بوخـاری رەحمەتیـە)، سەرچـاوەی دوەمـی ئـەم باسـانەیە، (موطـأ)ی مالیـك یەکەمینـە، هـەمو کتێبـەکانی دیکـەی وەکـو القوشـەیری(مەبەستی ئیمام موسلیمی رەحمـەتی و کتێبەکەیـەتی) و، ترمـزی لەسەر ئەمان بینـا کـراون.. هیچیـشیان وەکو کتێبەکـەی ئـەبو عیـسا (ترمـزی) نین، ئەوەی ئەبوعیسا لە هەمویان جوانتر بەش بەش کراوە، خۆش بەدەستەوە دێـت، زو بـە مەبەسـتی خۆتـت دەگـەیێنێت، یاریـدەدەری سـەرەکی خوێنـدن و کارکردنە، چواردە زانستی تری لەخۆ گرتوە:

١. شیکاریی سەنەد.
٢. دیاری کردنی سەحیح.
٣. هەڵاوێردنی فەرمودەی لاواز.
٤. ناساندنی ڕێ و شێوازی جیاوازی سەنەدەکان.
٥. شایەتیدان و متمانەبەخشین بە پیاوچاك و سەرڕاستانی سەنەد.
٦. دیاریکردنی هەڵەو لاوازی پیاوانی سەنەد.
٧. دۆزینەوەی ناوی جیاوازی پیاوانی سەنەدەکان و ناساندنەوەیان.
٨. دۆزینەوەی کونیەی جیاوازی پیاوانی سەنەدەکان و ناساندنەوەیان.
٩. نیشاندانی سەنەدی پساو.
١٠. نیشاندانی سەنەدی گەیشتو.

---

[1] شەرحەکەی ناوی(عارضة الاحوذي في شرح سنن الترمذي) یە! مانای ناوی کتێبەکە ئەمەیە: عارضة واتە: توانای قسەکردنی احوذي: پیاوی زرنگ و قسەزان(لەبلەبان )، مەبەستی ئەوەیە، کە کەسانی قسەزان و لەبلەبانیش، ڕەخنەیان زۆر نابێت لەم کتێب و شەرحەی!!

منتدى إقرأ الثقافي

١١. رونکردنەوەی چۆنیەتی کارکردن بە فەرمودە.

١٢. رونکردنەوەی هۆی واز هێنان لە هەندێك فەرمودە.

١٣ـ راجوێیی زانایانی فەرمودەوانی لە قبولّ کردن یان رەفز کردنی فەرمودە.

١٤ـ ڕونکردنەوەی ڕاوبۆچونی زانایان و، وەرگرتنی حوکمی شەرعیی لە فەرمودە..

ـ حافز ئیبنولئەسیریش دەربارەی گویەتی: ئەوەی لە(سنن الترمذي)دا هەیە، لە کتێبەکانی دیکەدا نیە، وەکو ناساندنی بۆچون و ڕای مەزهەبەکان و، جۆری سەنەدی فەرمودەکە، کە سەحیحە، یان حەسەنە یان لاوازە، هەروەها چۆن زانایان و شەرعناسان حوکمی شەرعییان لە فەرمودەکەوە وەرگرتوە..

## مەرجەکانی ئیمام ترمزی:

حافز ئەبوفەزلی مەقدیسی دەڵێ: ئەبو عیسا کتێبەکەی کردوە بە چوار بەش[١]:

١. بەشی فەرمودەی سەحیح، کە گومانی تێدا نیە(ئەو فەرمودانەن، کە لە لای بوخاری، و موسلیمیش هەن).

٢ـ بەشێکی تر لەوانەن، کە مەرجی هەرسێ ئیمامەکانی، یان دوانیانی بەسەردا دەچەسپێت(مەبەستی لە ئیمامان: ئەبو داودو نەسائی و ئیبنو ماجەیە ).

٣ . بەشێکی تر ئەوانەن کە هۆی لاوازیەکەیانی لە لای زانایانی تری فەرمودەوانی رون کردۆتەود.

٤ . بەشی چوارەم ئەو فەرمودانەن، کە ترمزی خۆی هۆی لاوازیەکەیانی رون کردۆتەوە.

---

١ عەللامە شێخ ئەحمەد شاکر لە پێشەکیەکەیدا، کە بۆ(الجامع الصحیح ٨٨/١ )، کە باسی لە مەرجی سوحاحی سىتتە کردوە، ئەم بەش بەشکردنەی ئیمام ترمزی نوسیوە.

منتدى إقرأ الثقافي

ترمزی دەڵێ: لەم کتێبەمدا فەرمودەیەکم نەنوسیوە، کە کەس لە زانایانی پێشتر نەیهێنابێتەوەو کاری پێنەکردبێت...

حافزی مەقدیسی دەڵێ: ترمزی گلەیی خەڵکی لەسەر خۆی لاداوە بەوەی، کە خۆی حوکمی فەرمودەکانی دەرکردوە، کە ئایا سەحیحن، یان حەسەن، یان لاواز، هەروەها راڤەی یەك بەیەکیانی وا کردوە، کە هەمو کەسێك بە ئاسانی لێی حاڵیی ببێت... سەرەتا باسی لەو بابە کردوە، کە فەرمودەکەی تێدایەو، بۆچی ئەو فەرمودەیە لەوێیە ؟! پاشان چوّتە سەر شیکاری سەنەدی فەرمودەکەو ئەو یاوەرەی ناساندوە، کە فەرمودەکەی گێڕاوەتەوە، پاشان رێگاکانی تری سەنەدەکەی هێناوەتەوەو، لای کێ و لە هەر کوێیەکی سوحاحی ستتە هەبێت، ئاماژەی پێکردوە.. بۆ نمونە، دەڵێ: (وفي الباب عن فلان بن فلان) تا سەنەدەکان دەگەیێنێتەوە بە کۆمەڵێك لە یاوەرانی پێغەمبەرﷺ...

## کۆچی دوایی ئیمام ترمزی

زانایان و مێژونوسان لە کاتی کۆچی دوایی کردنی ئیمام ترمزیدا، زۆر راجوێ بون! سەمعانی لە کتێبی (الانساب) ەکەی خۆیداو، ئیبنو خەلەکانیش بەدوایدا (وفيات الاعيان ٢٧٨/٤) دەڵێن: لە ساڵی ٢٧٥ ك لە گوندی بوغ کۆچی دوایی کردوە، شێخ عابد السندی بە دەستوخەتی خۆی، لەسەر نوسخەیەکی نوسراوەی سونەنی ترمزی نوسیوێتی: ساڵی ٢٠٩ ك لە دایکبوەو ٦٨ ساڵ ژیا، چونکە لە ساڵی ٢٧٧ك کۆچی دوایی کردوە... بەڵام پێدەچێت ئەمە هەڵە بێت... ڕاست ئەوەیە (والله اعلم)، کە حافزی موززی لە(التهذيب)و، ئیبنو حەجەری عەسقەلانی لە(تهذيب التهذيب ٣٨٨/٩)دا نوسیویانە، کە حافزی موستەغفیری، کە مێژونوسێکی گەورەیەو، لەو سەردەمەدا چوّتە خۆراسان و، ماوەیەکی زۆر لەو ناوچانە ماوەتەوە(تهذيب التهذيب ٢٧٨/٩)، نوسیوێتی:(ئەبو عیسا ترمزی لە شارۆچکەی ترمز لە شەوی دوشەممەی١٣ی رەجەبی٢٧٩دا

منتدى إقرأ الثقافي

کۆچی دوایی‌کرد)...ئەمەش ئەو بەروارەی،کە زۆرینەی زانایان و شەرعناسان و مێژونوسانی وەکو، ئیمام زەهەبی و ئیبنو کەتیرو، ئەوانی دیکە ئیعتیمادیان کردوّتە سەرو، گوتویانە، کە ڕاستترینە. (تذكرة الحفاظ/الذهبي ٦٣٥/٢)، (البداية و النهاية/ابن كثير ٦٧/١١) عەللامە ئەحمەد شاکیریش لە راڤەو لێکۆڵینەوەی سونەنی ترمزیدا، هەر ئەوەی بە ڕاستتر زانیوە. (مقدمة سنن الترمذي/ احمد شاكر ١/ ٩١ ).

منتدى إقرأ الثقافي

# کەمێك دەربارەی(سنن الترمذي )

**کتاب الفتن١**

**باب ما جاء في رفع الامانة**

(عَنْ حُذَيْفَةَ بْنِ الْيَمَانِ حَدَّثَنَا رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ حَدِيثَيْنِ قَدْ رَأَيْتُ أَحَدَهُمَا وَأَنَا أَنْتَظِرُ الْآخَرَ حَدَّثَنَا (أَنَّ الْأَمَانَةَ نَزَلَتْ فِي جَذْرِ قُلُوبِ الرِّجَالِ ثُمَّ نَزَلَ الْقُرْآنُ فَعَلِموا من الْقُرْآنِ وَعَلِموا من السُّنَّةِ) ثُمَّ حَدَّثَنَا عَنْ رَفْعِ الْأَمَانَةِ فَقَالَ: (يَنَامُ الرَّجُلُ النَّوْمَةَ فَتُقْبَضُ الْأَمَانَةُ مِنْ قَلْبِهِ فَيَظَلُّ أَثَرُهَا مِثْلَ الْوَكْتِ ثُمَّ يَنَامُ نَوْمَةً فَتُقْبَضُ الْأَمَانَةُ مِنْ قَلْبِهِ فَيَظَلُّ أَثَرُهَا مِثْلَ أَثَرِ الْمَجْلِ كَجَمْرٍ دَحْرَجْتَهُ عَلَى رِجْلِكَ فَنَفَطَتْ فَتَرَاهُ مُنْتَبِرًا وَلَيْسَ فِيهِ شَيْءٌ ثُمَّ أَخَذَ حَصَاةً فَدَحْرَجَهَا عَلَى رِجْلِه قَالَ فَيُصْبِحُ النَّاسُ يَتَبَايَعُونَ لَا يَكَادُ أَحَدُهُمْ يُؤَدِّي الْأَمَانَةَ حَتَّى يُقَالَ إِنَّ فِي بَنِي فُلَانٍ رَجُلًا أَمِينًا وَحَتَّى يُقَالَ لِلرَّجُلِ مَا أَجْلَدَهُ وَأَظْرَفَهُ وَأَعْقَلَهُ وَمَا فِي قَلْبِهِ مِثْقَالُ حَبَّةٍ مِنْ خَرْدَلٍ مِنْ إِيمَانٍ) قَالَ وَلَقَدْ أَتَى عَلَيَّ زَمَانٌ وَمَا أُبَالِي أَيُّكُمْ بَايَعْتُ فِيهِ لَئِنْ كَانَ مُسْلِمًا لَيَرُدَّنَّهُ عَلَيَّ دِينُهُ وَلَئِنْ كَانَ يَهُودِيًّا أَوْ نَصْرَانِيًّا لَيَرُدَّنَّهُ عَلَيَّ سَاعِيهِ فَأَمَّا الْيَوْمَ فَمَا كُنْتُ لِأُبَايِعَ مِنْكُمْ إِلَّا فُلَانًا وَفُلَانًا)...

**تێگەیشتن لەم فەرمودەیە، وردەکارییەکی باشی دەوێت، ئاگادار بە:**

**حوزەیفەی کوڕی یەمان خوا لێی رازی بێت، یاوەرێکی باوەڕ پێکراوی پێغەمبەری خوایە، لە ساڵی ٣٦ کۆچیدا لە سەردەمی سەیدنا عەلی کوڕی ئەبو تاڵیبدا کۆچی دوایی کرد، لەسەردەمی سەیدنا عوسمانی کوڕی عەففاندا خوا لێی ڕازی بێت، ئەمەی گێڕایەوەو گوتی:**

**پێغەمبەری خواﷺ دو فەرمودەی دەرهەق ئەمانەت پێ ڕاگەیاندوین، یەکیانم بە چاوی خۆم دیوەو چاوەڕوانی هاتنە دی ئەوی تریان دەکەم، پێغەمبەرﷺ فەرموی: (ئەمانەت پاراستن دابەزییە ناو دڵی پیاوانی بەهێزەوە،**

---

١ بوخاری ب ١٤/١١٦/الرقائق(ژمارە ٦٤٩٧)، موسلیم ژمارە ١٤٢/الایمان/باب رفع الامانە، ترمزی / الفتن ژمارە ٢١٧٩، ئیبنو ماجە/الفتن ژمارە ٤٠٥٣، ئیمام ئەحمەد ب ٣٨٣/٥.

منتدى إقرأ الثقافي

لەوێدا جێگیر بو، قورئانیش دابەزیی و ئاودێری کرد، سوننەتییش چاودێری کرد، تا خۆی گرت)[١] پاشان دەربارەی ئەمانەت نەپارستن دوا، فەرموی: (پاشان کابرا دەخەوێت، ئەمینداریێتیەکەی لە دڵی هەڵدەگیرێت و، تەنها ئاسەوارێکی لێ دەمێنێت! بەقەدەر ئاسەواری پشکۆیەك کە بەسەر لاقتدا غلۆری کەیتەوە! کە لێرەو لەوێ خاڵ خاڵی دەکات و، دەیکاتە تلۆقێکی دیار، کە سەرەنجامی کارکردن نەبوە )! لەو کاتەشدا پێغەمبەرﷺ بەردوچکەیەکی هەڵگرت و بەسەر لاقی پیرۆزی خۆیدا غلۆری کردەوە، خەڵکەکەش بە واق وڕماویەوە سۆراغیان دەکرد...

ئینجا فەرموی: (ئیدی وای لێ دێت، کە ئەمینداریێتی و ئەمانەت نامێنێت[٢] تا دەوترێت: لە فلان هۆز پیاوێکی دەسپاکی لێیە، ئەمانەت دەپارێزێت! ئیدی خەڵکی مەتحی دەکەن و دەڵێن: چەند پیاوێکی بە ئارامە، پیاوچاکە، زیرە، خاوەن هەڵوێستە! لە کاتێکدا، کە مسقاڵە زەڕڕەیەك باوەڕی لە دڵ و دەرونیدا نیە!

ئەوجا حوزەیفە لەسەر قسەی خۆی بەردەوام دەبێت و دەڵێ: ئێی، زەمانێك بو خەمم نەبو بەیعەت بە کێ دەدەم[٣]، پێم ئاسایی بو بەیعەت بە کێتان بدەم، چونکە دەمزانی ئەوی موسوڵمان بوبێت و پەیمان و بەڵێنم لەگەڵیدا بەستبێت، ئەوە سەر ڕاستانە وەریگرتوەو لە قیامەتتدا شایەتیم بۆ دەدات[٤]، ئەوی جولەکەو دیانیش بوبێت و دینەکەم پێ گەیاندبێت و وەری نەگرتبێت، یان پەیمان و بەڵێنێکم لەگەڵیدا هەبێت، ئەوە هەر لەژێر سایەی شەرعەکەدایەو والیەکان مافی خۆمیان لێ وەردەگرن.. کەچی ئێستا کەوتومەتە زەمانێکەوە لە ناوتاندا، مەگەر بەیعەت تەنها بە فلان و فلان بدەم...

---

١ مەبەست لە ئەمانەت دین و دینداریی و بانگەوازەکەیەتی والله اعلم..

٢ پاراستنی ئەمانەت دەبێتە کارێکی زەحمەتی پیاوان.

٣ یەعنی یاوەرە بەڕێزەکانی پێغەمبەرﷺ لە سەردەمی ژیانی پێغەمبەری پێشەواﷺو، پاشان لە سەردەمی سەیدنا ئەبوبەکرو سەیدنا عومەردا، ئەوەندە دیندارو جیددی بون، کە بەیعەتی بە هەر کەسێکیان بدایە شایانی بو، چونکە پیاوی پاراستنی ئەو ئەمانەتە خواییە بون !

٤ پیاوانە ئەمانەتەکە دەهێنێتەوە.

منتدى إقرأ الثقافي

# ئیمام نەسائی( ﷺ )

## ( ٢١٥ ـ ٣٠٣ ك )

## ناو و ڕەچەڵەکی

ـ حافزو ئیمام، شێخولئیسلام ئەبو عبدالرحمان ئەحمەدی کوڕی شوعەیبی کوڕی عەلی کوڕی سینانی کوڕی بەحری خۆراسانی..

## لە دایکبون و ڕەچەڵەکی

ئیمام نەسائی ساڵی ٢١٤ ك دوسەدو چواردە، یان دوسەدو پازدەی کۆچی لە ناوچەی (نەسا) لە دایکبوە کە شارۆچکەیەك بوە سەر بە خۆراسان، نێوان نەساو سەرەخس(کە ئێستا گوندێکی سەر بە مەشهەدی ئێرانەو سوننی نشینە) دو ڕۆژە ڕێیە، نێوان نەساو مەرۆ(ئێستا ویلایەتێکی ئەفغانستانە) پێنج ڕۆژەڕێیە، نێوان نەساو ئەبیوەرد(ئێستا لە ئێراندایە)، یەك ڕۆژە ڕێیەو نێوان نەساو نەیسابور(ئێستا لە ئێراندایەو بە نەیشابور دەوترێت) حەوت ڕۆژە ڕێیە.. کۆمەڵێکی بەرچاو لە زانایان لە نەسا گەورە بون و لەوێش هەڵکەوتون.

## ناوی نەسا

زانایانی پیاوناسیی و مێژونوسان لەسەر ئەوە ڕێکن، کە هۆی ناونانی ئەو شوێنە بە نەسا بۆ ئەم ڕوداوە سەیرە دەگەڕێتەوە:

کە لەشکری ئیسلام بۆ یەکەمین جار گەیشتە ئەم ناوچەیەو هەواڵەکەیان بڵاو بۆوە، پیاوانی ناوچەکە هەمو هەڵاتن و، تەنها ژنیان لەوێ مایەوە، کاتێك

منتدى إقرأ الثقافي

لەشکرەکە هاتە ناو شار، بینی هەر ژنی لێیە، فەرماندەکەیان فەرمانی پێکردن، شار جێی بهێڵن و بێنەوە دەرێ، ماوەیەکی پێچو پیاوان هەر نەهاتنەوە، ئیتر موسوڵمانان لە ناو خۆیاندا، کە ناوی ناوچەکەیان دەهێنا، دەیانوت شاری (نساو) واتە شاری ژنان.. کە دەبو لە ڕوی زمانەوانیەوە بوترێت نیساو، نەك نەسا، یان نەساو، بەڵام دیارە هەڵەی بەناوبانگ، باشترە، لە ڕاستی وازلێهێنراو، بۆیە بۆ ئەم ئیمامە بەڕێزەش دەوترێت، ئیمام نەسائی..

## دینداریی و تەقوای

ئیمام نەسائیﷺ لە لوتکەی تەقواو خواناسیدا بو، وەرعێکی زۆر سەیری هەبو، گومانلێکراوی حەرام قسە بوایە، یان خۆراك و پۆشاك توخنی نەدەکەوت، چ جای حەرام.. سەرنجی ئەم روداوە بدە: جارێکیان مامۆستایەکی، کە ناوی حەرسی کوڕی مسکین بو، لە نەسائی زویر بو، نەسائیش دڵی لێی شکاو کۆڕی دەرسی ئەوی واز لێهێنا، بەڵام بۆ ئەوەی لە زانیاریەکەشی مەحروم نەبێت، بەرماخی دەکردو بە نهێنی دەهاتە بەر دەرگای مزگەوتەکەو، گوێی لە ڕیوایەتەکانی مامۆستاکە دەگرت، لەبەر تەقواو دینداری خۆی، هەرچی فەرمودەیەکی بەو شێوە لەو مامۆستایەوە نەقڵ کردوە، نەینوسیوە: (حدثنا) واتە: بۆی گێڕاینەوە یان(اخبرنا) واتە: هەواڵی داینێ، بەڵکو لە سونەنەکەیدا نوسیوێتی: (قرئ و انا اسمع) واتە: خوێندرایەوەو منیش گوێم دابویێ! بەڵام لە ڕیوایەتی هەمو مامۆستاکانی دیکەیدا دەڵێ: (حدثنا، أخبرنا).

## وەسف و مە تحی

هەمو زانایان لەسەر گەورەیی و پێشەوایەتی و شەرعناسێتیەکەی ڕێکن.

ـ حاکم لە دارەقوتنیەوە دەگێڕێتەوە: ئەبو عەبدالرحمانی نەسائی لە هەمو زانایانی تری سەردەمی خۆی لە فەرمودەوانیدا لەپێشترە.. ئەو، بێ

منتدى إقرأ الثقافي

چەندوچون پێشەوای فەرمودەوانیە (ابن كثير: البداية و النهاية١١/١٢٣).

ـ ئیبنو یونس دەڵێ: نەسائی پێشەوای فەرمودەیە، جێمتمانەیە، حافزێكی وردەكارە. (ابن كثير: البداية و النهاية١١/١٢٣، تهذيب التهذيب ٣٨/١).

ـ ئیبنو عەدی دەڵێ: گوێم لێبو مەنسوری فەقیە و، ئەحمەدی كوڕی محمدی كوڕی سەلامەی تەحاوی دەیانگوت: ئەبو عبدالرحمانی نەسائی، یەكێكە لە پێشەوای موسوڵمانان. (تهذيب التهذيب ٣٨/١).

ـ ئەبولحوسەینی كوڕی موزەففەر دەیفەرمو: گوێم لە ماموٚستایانمان بو لە میسر دەرهەق ئیمام نەسائی دەیانفەرمو: نەسائی پێشخستن و پێشەوایەتی قابیلە.. (تهذيب التهذيب ٣٨/١).

ـ مەئمونی میسری دەڵێ: چوین بۆ تەرسوس(لە سوریایە) كۆمەڵێك حافزی فەرمودەوانانمان لێ كۆبۆوە، لەوانە عبداللەی كوڕی ئەحمەدو، مەرتەع و، ئەبولئەزان و، كێلچەو هی تریش، هەر هەمویان نەسائیان بە پێشەوای خۆیان هەڵبژاردبو! (تهذيب التهذيب ٣٨/١)..

## قۆزێتی و چوارژن هێنانی

ئیمام ئیبنو كەثیر دەڵێ: ئەوانەی لە نزیكیەوە بون و وەسفیان كردوە، گوتویانە كە زۆر قۆز بوە، شۆخ و شەنگانە خۆی رێكخستوە، دەموچاوی دەتوت چرایە، چوار ژنی هەبو، دەوڵەمەند بو، شەوانە مریشكێكی لە ئاوی مێوژ هەڵدەكێشاو، سبەی سوری دەكردەوەو دەیخوارد. (ابن كثير: البداية و النهاية١١/١٢٣، ابن خلكان: وفيات الاعيان ٧٨/١ ).

ـ ئیمام زەهەبی دەربارەی ئیمام نەسائی دەڵێ: ڕوی زۆر گەش و جوان بو، دەزولە خوێنینەكانی دیار بون، لەگەڵ پیرێتیشیدا هەر پۆشاكی جوانی دەپۆشی، بوردەی نۆبی(جۆرێك عەبای بەنرخە)دەدا بەسەر شانیدا، چوار ژن و

منتدى إقرأ الثقافي

کەنیزەکی هەبو دادپەروەرانە رەفتاری لەگەڵدا دەکردن، کەڵەشێری گەورەیان بۆ دەکڕی و بۆیان بەخێو دەکرد، دەیانخەساندن تا قەڵەوتر بن.. لەبەر ئەمە بو، کە جارێك یەکێك لە قوتابیەکانی وتی: ڕەنگە ئیمام نەسائی شەراب بخواتەوە بۆیە وا دەموچاوی سوروسپی و ناسکە !! (تذکرة الحفاظ ٦٩٩/٢).

## خواناسیی و جیهاد کردنی

ئەبولحوسەین محمدی کوڕی موزەففەر گوتی: گوێم لێبو مامۆستایانمان لە میسر، کە باسی نەسائیان دەکرد، جگە لە پێشەوایەتی فەرمودەوانیەکەی دەیانگوت: نەسائی خاوەن شەونوێژو عیبادەتی شەو و ڕۆژە، حەجکردنی ساڵانەی ڕێکە، بەردەوام لە جیهادە، زمانی بە زیکرو ویردەکان پاراوە، لە کۆڕی سوڵتان دورە، تا ئەمانە، تا رۆژی شەهیدبونی سیفەتی نەگۆڕاوی بون. (ابن کثیر: البدایة و النهایة١٢٣/١١، الذهبي: تذکرة الحفاظ ٧٠٠/٢).

ـ هەروەها دەربارەی دەیگوت: جارێکیان نەسائی لەگەڵ ئەمیری میسردا چوە غەزا، ئەمیری میسر ئەوەندە بە ئازایەتی و سوارچاکیەکەی نەسائی سەرسام بوبو، لە هەمو کۆڕو دانیشتنێکیدا، هەر باسی ئەوی دەگێڕایەوە! باسی دەکرد، کە چۆن و چەند جار خۆی خستۆتە دژواریەوەو، خۆی فیدای موسوڵمانان کردوە. یان باسی ئەوەی دەکرد، کە چەند خۆی لە کۆڕو ئەنجومەنی سوڵتان و دەسەڵاتداران دەپارێزێت، تەنانەت لە کۆڕی ئەم ئەمیرەی میسریش، کە جیهادی لەگەڵدا دەکرد! ئەمیر باسی چۆنیەتی سادەیی خەو خۆراکی نەسائی دەگێڕایەوە، کە سیمایەکی نەگۆڕی بوە... زانایانیش ئەم سیفەتانەی باس دەکەن و دەڵێن، تا ئەو رۆژەی لەسەر دەستی خەواریج کوژرا، هیچ یەکێك لەم سیفەتانەی نەگۆڕا! (الذهبي: تذکرة الحفاظ ٧٠٠/٢) دەیانگوت نەسائی رۆژە نارۆژ بەڕۆژو دەبو...(ابن کثیر: البدایة و النهایة١٢٣/١١، ابن خلکان: وفیات الاعیان ٧٨/١ ). بڕوانە ئەم هەمو سیفەتانەی لەم کەسایەتیە پیرۆزەدا کۆبۆتەوە! کە

منتدى إقرأ الثقافي

هەر یەكەیان تەمەنێكی دەوێت، تا تێتدا دەبنە سیفەت! زانست و كار، شەونوێژو جیهاد، ساڵی حەج و ساڵێك جیهاد !! پاشان بڕوانە دەوڵەمەندێتی و ڕەشوكێتی شەعبیانە، ئینجا دورە پەرێزیی لە سوڵتانێك، كە ئەمیرێتی جیهادیشی كردوەو ئەم خۆی بینوێتی و، لەبەرەی جەنگدا لەگەڵیدا بوە، ئینجا ئامادە نەبوە هاتوچۆی كات !!

## تۆمەتباركردنی بە شیعەگەرێتی!

ئیمام ئیبنو كەسیر دەڵێ: هەندێك پێیان وابو، كە بۆتە شیعە (چونكە كتێبێكی بە ناوی(الخصائص) لەسەر سەیدنا عەلی كوڕی ئەبو تالیب نوسی بو) بۆیە، كە چوە دیمەشق لە مزگەوتی ئەمەوی لێی كۆبونەوەو لێیان پرسی، بۆچی هیچت لەسەر معاویەی كوڕی ئەبو سوفیان نەنوسیوە ؟ گەلێ: مەگەر معاویە ئەوەندەی بەس نیە، كە بە سەری خۆیەوە قوتاری بێت ؟! چ فەزیلەتێكی هەیە، تا بنوسرێتەوە ؟! ئیتر بە لێدان و شەق هەڵدان لە گونی داباریندە سەری(ابن كثیر: البدایة و النهایة ١٢٣/١١ ). نەسائی ئەو كتێبەی نوسی بێ ئەوەی هیچ لەسەر سەیدنا معاویەی كوڕی ئەبو سوفیان بنوسێت، بۆیە وایان لێكرد، زانایان باس لە شێوەی لێدانەكەی نەسائی دەكەن، كە عەیب نەبێت بە گونی ڕایانكێشایە دەرەوەی مزگەوتەكەو هەندێك دەڵێن، كە ئاوا لە دیمەشق شەهید بوە !! بەڵام وا پێناچێت ئەو كاتەو لەوێ كۆچی دوایی كردبێت...

لە بەدواداچونی مێژویی و لێكۆڵینەوەیدا ڕون دەبێتەوە، كە تۆمەتی شیعەگەرێتی بە هەوانتە دراوەتە پاڵی، چونكە ئەو زانایەكی ئەوەندە شارەزایە، كە قەدری هەمو یاوەرانی پێغەمبەریﷺ لا بێت. هۆكاری دانانی ئەو كتێبەشی، خۆی لە پێشەكی كتێبەكەدا نوسیوێتی، كە دەڵێ: كە چومە دیمەشق بینیم، خەڵكێكی زۆر دەربارەی سەیدنا عەلی لە حەق لایانداوە،

منتدى إقرأ الثقافي

منیش ئەم کتێبەم نوسی، بەو ئومێدەی خوای گەورە بیکاتە هۆی هیدایەت دانەوەیان. (تذكرة الحفاظ ٦٩٩/٢).

ئیمام نەسائی دوای ئەو کتێبە، کتێبی دیکەشی لەسەر فەزڵ و گەورەیی یاوەران نوسی.

بەڵام دیارە هەڵوێستی لە سەیدنا معاویە توندو تیژ بوە، چونکە، کە لێی دەپرسن بۆچی فەرمودەی سەیدنا معاویە ریوایەت ناکەیت ؟ دەڵێ: ئاخر چی هەیە، تا لێوەی ریوایەت کەم؟! فەرمودەی(اللهمَ لا تشبعْ بَطنَهُ)؟! واتە(دەی خوایە سکی تێر نەکەیت) ریوایەت کەم؟ ئیتر خاوەن پرسیارەکان بێدەنگ دەبون..

## ڕونکردنەوەیەکی گرنگ:

ئەمەی ئیمام نەسائی ئاماژەیە بۆ فەرمودەیەکی دورودرێژ، کە لە سەحیحی موسلیمدایەو، ئیبنو عەبباس خوا لێیان رازی بێت ریوایەتی کردوە، کە دەڵێ: لەگەڵ منداڵاندا گەمەم دەکرد، پێغەمبەری خواﷺ تەشریفی هێنا، منیش خۆم لە پشت دەرگاوە شاردەوە، بەڵام دۆزیمیەوەو فەرموی: (اذهبْ وادع لي معاوية) بڕۆ معاویەم بۆ بانگ بکە، چوم و هاتمەوە عەزرم کرد: معاویە نان دەخوات، فەرمویەوە: (اذهبْ وادع لي معاوية) بڕۆ بۆم بانگ کە، چومەوە و هاتمەوەو دیسان عەرزم کرد ئەی پێغەمبەری خوا: معاویە نان دەخوات، فەرموی (اللهمَ لا تشبعْ بَطنَهُ) مسلم ژمارە ٢٦٠٤... بەڵام زانایان لە لێکدانەوەیدا رایان جیاوازە، هەیانە گویەتی: ئەمە دیارە کە دوعایەو لێی کردوە، بەڵام ئەگەر وایە چۆن دەشێت گیرا نەبوبێت، خۆ لەوەو دوا نەبیستراوە، کە سەیدنا معاویە تێری نەخواردبێت و، بە برسێتی لە ژیاندا مابێتەوە، بە تایبەتی کە بو بە خەلیفە! هەندێکی تریان گوتویانە، ئەمە وتەیەکی ناو زمانی عەرەبیەو بۆ دوعا ناوترێت، پێغەمبەریشﷺ هەر وەکو عورفی زمانەوانی بەکاری هێناوە،

منتدى إقرأ الثقافي

وەكو(ثكَلَتكَ أمُكَ) دايك رۆڵەڕۆت بۆ بكات وايە.. ئێمەش لە كورديدا سەدان وشەی وامان هەيە، وەكو: ياخوا پير نەبيت (مەبەست ئەوەيە، كە هەميشە گەنج و بەخۆو بە توانا بمێنيتەوە بەلاّم دەشێت يەكێك بە پێچەوانەی مەبەستەوە لێكی بداتەوەو بڵێ مەبەستی ئەوەيە، كە بە گەنجی بمريت !.. يان دەوترێت: وەی دايكت بمرێ! خۆ ئەمە دوعا نيەو لێی بكرێت، بەڵكو مەبەست ئەوەيە، كە من دايكتم و بۆت بمرم، واتە بە قوربانت بم، نەك دايكی حەقيقيت كۆچی دوايی كات... هەندێك زانای ديكە گوتويانە، ئەمە فەزڵێكيەو بۆ سەيدنا معاويەيە، چونكە پێغەمبەرﷺ لە دوعايەكيدا دەفەرموێ: (اللهُمَّ إنَّمَا أنَا بَشَرٌ، فأيُّ المسلمينَ لعَنْتهُ أو سَبَبْتهُ فاجعَلهُ لهُ زكَاةً وأجْرًا) مسلم ٢٦٠٠ واتە: خوايە من بەشەرێكم، لەعنەتم لە هەر موسوڵمانێك كرد، يان جنێوم پێدا، خوايە بۆی بكەيتە زەكات و پاداشت... ئێمەش پێمان وايە پێغەمبەری نازدارﷺ هەر وەكو عورفە زمانەوانيەكە، ئەو دوعايەی بەكار هێناوە، چونكە دوعا لێكردنی بە مەحروم بونی وا، چۆن لەگەڵ ئەو دوعا گەورەيەيدا دەسازێت، كە لە پێنج سەنەدی راستەوە هاتوە، كە بۆ سەيدنا معاويە دەفەرموێ: (اللهُمَّ اجْعَلْهُ هادِيًا مَهْدِيًا، واهْدِهِ، واهْدِ بِهِ) الالباني: سلسلة الاحاديث الصحيحة ٩٦٩١/٤ واتە: خوای بيكە بە مايەی ڕێنمايی و ڕێنيشاندەريی، خوايە هيدايەتی بدەو بەويش هيدايەتی كەسانی تر بدە! ئەوەش بزانين، كە هەر چوار خەليفە بەڕێزەكە، ئەبوبەكرو عومەرو عوسمان و عەلی، سەيدنا معاويەيان بە والی شام هێشتەوە، چونكە كاريگەريی گەورەی لەسەر موسوڵمانان بو و پاراستنی ئەمنيەتی ڕەعييەتەكەو، پەيوەندی سنوری ئوممەت و خيلافەتی، بە پارسەنگی لەگەڵ مەسيحی و جولەكەكاندا دەپاراست.

ئيمام ئيبنو تەيميە‌رحمه الله دەڵێ: كەس لە فەرمودەوانان نابينيت بوبێتە شيعە، يان فەزڵی عەلی كوڕی ئەبوتاليبی دابێت بەسەر ئەبوبەكرو عومەردا، بەلاّم هەيانە لايەنگيرێكی توندتری عەلی كوڕی ئەبو تاليب بوە وەكو نەسائی و ئيبنو عەبدولبەڕ..(منهاج السنة النبوية ٩٩/٤).

منتدى إقرأ الثقافي

بە هەر حاڵ ئەوە زۆر لە ئیمام نەسائی دورە، کە کەوتبێتە ژێر کاریگەریی شیعەوە، ئاشکراشە، کە پابەندی مەزهەبی شافیعی بوە، بۆیە کتێبی(مناسك الحج) ەکەشی، کە نوسیویێتی، تەنها لەسەر مەزهەبی ئیمام شافیعی(ﷺ) نوسیوێتی...

## کێشەو ململانێکەی

محمدی کوڕی ئیسحاقی ئەسبەهانی دەڵێ: لە مامۆستایانی خۆمانم لە میسرەوە بیستوە، کە دەیانگوت: ئەبوعبدالرحمانی نەسائی لە کۆتایی ژیانیدا، میسری بەجێ هێشت و چوە شام، لە دیمەشق دەربارەی سەیدنا معاویە لێیان پرسی بو، کە فەزیلەتی چی هەیە ؟ ئەویش لە وەڵامدا وتبوی: جا معاویە چ فەزیلەتێکی هەیە ؟ ئەوەندەی بەس نیە، کە سەر سەلامەت و بە مایەی خۆیەوە دەرچێت ؟ ئیتر ئەوەندەیان لێدابو، تا کەوتبو، پاشان بە گونی رایانکێشابوە دەرەوەی مزگەوتی ئەمەوی و، شاربەدەریان کردبو بۆ شاری رەمەلەی فەڵەستین، لەوێ کۆچی دوایی کرد..(وفيات الاعيان ٧٧/١، تذكرة الحفاظ ٧٠٠/٢ ).

حافز ئەبولحەسەنی دارەقوتنی دەڵێ: کاتێك نەسائی لە دیمەشق ئەو بەڵایەی بەسەر هات، داوای کرد بیبەن بۆ مەککە، ئیتر بردیانە مەککەو لەوێ کۆچی دوایی کرد.. (وفيات الاعيان ٧٧/١، تذكرة الحفاظ ٧٠٠/٢ ).

## گەشت وگەڕانی بە دوی زانستیدا

ئیمام نەسائی وەکو هەمو زانایانی تری ئیسلام، لە تەمەنێکی زویەوە کەوتۆتە گەشت و گەڕان بە دوای زانستی شەرعیداو، بۆ وەدەستهێنانی زۆرترین زانست، بە تایبەتی فەرمودە، زۆر وڵات گەڕاوەو چۆتە خزمەت سەدان زانای هەڵکەوتەی ئەو سەردەمەی خۆی... ئەو کاتەی تەمەنی پازدە

منتدى إقرأ الثقافي

سالآن بو، یەکەمین غوربەتی لە پێناوی زانستدا کێشاو وەکو ئیمام زەهەبی دەڵێ لەو تەمەنەدا چوە خزمەت قوتەیبەی کوڕی سەعیدی بەڵخی و، وەکو خۆی گوتویەتی، ساڵێك و دو مانگ لە خزمەتیدا مامەوە. (تذكرة الحفاظ ٦٩٨/٢). قوتەیبەی کوڕی سەعیدی بەڵخی، قوتابی ئیمام مالیك و لەیسی کوڕی سەعدو حەممادی کوڕی یەزیدو، مامۆستا ئیمام ئەحمەدی کوڕی حەنبەل و یەحیای کوڕی مەعین و بوخاری و موسلیم و ئەبوداودو ترمزی و ئەبو حاتەمی رازی و ئەبو زەرعەو عبداللەی کوڕی موبارەك و فوزەیلی کوڕی عەیازو جەریری کوڕی عبداللەو دەیانی دیکە بوە...

دوای ئەوە چاوی کرایەوە، چوە خۆراسان و عێراق و حیجازو میسرو شام و جەزیرەو شوێنی تر. ماوەیەکی زۆر لە میسر بو، لە قاهیرە لە گەڕەکی قەنادیل.. زانایانی هاودەنگی دەیانگوت، تا ئەو ساڵەی لە میسر دەرچو(١٣٢ ك)، زۆر هۆگری حەج و جیهاد بو. (ابن كثير: البداية و النهاية ١٢٣/١١).

## مامۆستاکانی ئیمام نەسائی

لە مامۆستاکانی ئیمام نەسائی: قوتەیبەی کوڕی سەعیدی بەڵخی و، ئیسحاقی کوڕی راهەوەی(راهۆیە) وهیشامی کوڕی عەممارو، عیسای کوڕی زەغبەو، محمەدی کوڕی نەزری مروزی و، ئەبو کورەیب و، سوەیدی کوڕی نەسری شاو، سولەیمانی کوڕی ئەشعەس و، ئیسحاقی کوڕی شاهین و، حارسی کوڕی مسکین و، مەحمودی کوڕی غەیلان وئیسحاقی کوڕی موسای ئەنساری و، ئیبراهیمی کوڕی سەعیدی حەوهەری وئیبراهیمی کوڕی یەعقوبی جوزجانی‌و، محمەدی کوڕی بەششارو، عەلی ئیبنو حەجەرو، ئەبو داودی سەجستانی و، عەلی کوڕی خەشرەم و، ئەحمەدی گەڕی عەبدەو، دوحەیم و دەیانی دیکە، کە لە سەرچاوەکانی ژیاننامەی ئیمام نەسائیدا ناو هێنراون...(تهذيب التهذيب ٢٧/١، سنن النسائي / شرح السيوطي ١/ب).

منتدى إقرأ الثقافي

## فەقیێکانی ئیمام نەسائی

سەدان کەس قوتابی ئیمام نەسائی بو، لەوانە: ئیمام ئەبولقاسمی تەبەرانی، ئەبو عەلی حوسەینی کوڕی عەلی نیاموزی تەبەرانی و، ئەحمەدی کوڕی عومەیری کوڕی جوساو، محمدی کوڕی جەعفەری کوڕی قەلاس و، ئەبولقاسمی کوڕی ئەبولعەقەب و، ئەبولمەیمونی کوڕی راشیدو، ئەبولحەسەنی کوڕی خەزلوم و، ئەبو سەعیدی ئەعرابی و، ئیمام ئەبوجەعفەری تەحاوی و، محمدی کوڕی هارون و ئیبراهیمی کوڕی محمدی کوڕی سالّحی کوڕی سینان و، ئەبوبەکر ئەحمەدی کوڕی محمدی کوڕی ئیسحاقی کوڕی سونی حافزو، ئەبو عەلی ئەلحەسەنی کوڕی خدری ئەسیوتی و، ئەبولقاسم حەمزەی کوڕی محمدی کوڕی عەلی کەتتانی حافزو، محمدی کوڕی معاویەی کوڕی ئەحمەرو، محمدی کوڕی قاسمی ئەندەلوسی و، عەلی کوڕی ئەبو جەعفەری تەحاوی و دەیانی تر.. (تهذيب التهذيب ٣٧/١، سنن النسائي / شرح السيوطي ١/ب).

## کتێبەکانی ئیمام نەسائی

ئیمام نەسائی لەو زانایانەیە، کە کتێبیان زۆر نوسیوە ، کتێبەکانی بە شێوەیەکی گشتی لە باسی فەرمودەوانیدان، لە باسەکانی سەنەدو پیاوناسیی و سەحیح و زەعیفی حەدیسن، لە بەناوبانگترین و گەورەترین کتێبی، ئەمانەی خوارەوەن، کە لە هەمویان گرنگتر کتێبی(السنن)ە:

١. السنن الكبرى. ٢. تفسير القران العظيم. ٣ ـ الجمعة. ٤. مناسك الحج.
٥. عمل اليوم و الليلة. ٦. خصائص علي رضي الله عنه. ٧. فضائل القران الكريم.
٨ـ المجتبى. ٩. الكنى. ١٠ ـ الضعفاء و المتروكين. ١١. التمييز[١].
١٢. معجم شيوخ النسائي. ١٣ـ كتاب الطبقات. ١٤ـ کتێبێکی تر لەسەر معرفة

---

١ سیوتی رەحمەتی خوای لێ بێت لە کتێبی(تدريب الراوي ٢٦٤/٢) دا ناوی وا هێناوە(اسماء الرواة و التميز بينهم ).

منتدى إقرأ الثقافي

الاخوة و الاخوات من العلماء و الرواة.

١٥ ـ مسند حديث مالك بن أنس. ١٦ ـ مسند حديث الزهري بعلله و الكلام عليه.

١٧ـ مسند حديث شعبة بن الحجاج بن الورد. ١٨ـ مسند جديث سفيان بن سعيد الثوري.

١٩ـ مسند حديث يحيى بن سعيد القطان.

٢٠ـ مسند حديث فضيل بن عياض و داود الطائي ومفضل بن مهلهل الضبي.

٢١ـ مسند علي بن ابي طالب. ٢٢ـ مسند منصور بن زاذان الواسطي أبو المغيرة الثقفي.

٢٣ـ مسند حديث ابن جريح. ٢٤ـ كتاب الاغراب[1].٢٥ الجرح و التعديل.

٢٦ـ تسمية فقهاء الامصار من أصحاب رسول الله و من بعده من أهل المدينة.

٢٧ـ تسمية من لم يرو عنه غير واحد.٢٨ـ شيوخ الزهري.

---

[1] ئەم كتێبە هەر دو مەسنەدەكەی شوعبەو سوفیانی سەورییە، بەڵام ئەو فەرمودانەی تێدا هێناونەتەوە، كە شوعبە ریوایەتی كردون و لای سوفیان نیە، یان سوفیان ریوایەتی كردون و لای شوعبە نیە..

منتدى إقرأ الثقافي

## كتێبی السنن الكبری ی ئیمام نەسائی

سەید جەمالوددین دەڵێ: ئیمام نەسائی لە سەرەتادا، كتێبێكی نوسی ناوی نا (السنن الكبری)، ئەم كتێبە زۆر گەورەیە، كتێبی وا لەسەر فەرمودەو ڕێ جیاوازەكانی سەنەدو، ڕونكردنەوەی چۆنیەتی تەخریج كردنی فەرمودە نەنوسراوە..

- تاجی سوبكی لە (ئیمام سوبكی) باوكی وئیمام زەهەبی مامۆستایەوە نەقڵ دەكات كە ئیمام نەسائی لە ئیمام موسلیم حافزتربوە، كتێبی سوننەكەشی، لە دوای هەردو سەحیحەكەی بوخاری و موسلیم باشترین كتێبی فەرمودەیە، كە كەمترین فەرمودەی زەعیفی تێدایە..

- ئیبنو میندەو ئیبنوسسوبكی و ئەبو عەلی نەیسابوری و ئەبو ئەحمەدی كوڕی عەدی و خەتیبی بەغدادی و دارەقوتنی دەڵێ: هەرچی لە سونەنی نەسائیدایە سەحیحە، مەگەر ئەوانەی خۆی بە لاوازی دانابن، ئەوانەش خۆی ناساندونی..

ـ الحاكم و خەتیبی بەغدادی دەڵێن: وەسفی ئەو زانایانەی پێشو بۆ سونەنی نەسائی، راستەو لەجێی خویدایە، چونكە نەسائی مەرجی وای بۆ قبوڵ كردنی فەرمودە هەبوە، لە مەرجەكانی ئیمام موسلیم قورستر بوە، لەبەر ئەوەیە، كە هەندێك زانای وڵاتی مەغریب، تەنانەت نەسائی دەخەنە پێش تەنانەت بوخاریشەوە!(سنن النسائي بشرح السيوطي ١/د، شروط الائمة الستة / الحافظ محمد بن طاهر المقدسي. ).

منتدى إقرأ الثقافي

## هۆی دانانی کتێبی(المجتبی)

ئیبنولئەسیر دەڵێ: ئەمیرێکی میسر لە ئیمام نەسائی پرسی: هەمو فەرمودەکانی کتێبەکەت سەحیحن ؟! گوتی: نەخێر، ئیتر ئەمیر فەرمانیدا، کە فەرمودەکانی هەڵاوێرن، ئەوانەی بە تەئکید سەحیح بون، کۆکرانەوەو کرانە کتێبێکی سەربەخۆو، ناونرا(المجتبی)، واتە هەڵبژاردە! یان(المجتنی) واتە چنراو(لە چنین بەرهەمەوەیە نەك چنین و رستن ). هەردو ناوەکەشی ڕاستن، بەڵام ڕاستریان یەکەمیانە.

**مەرجەکانی نەسائی**

ئەبو عەلی الحافز دەڵێ: نەسائی لە پێشەوایانی گەورەی موسوڵمانانە، ئەو لە وەرگرتنی فەرمودەو بە سەحیح زانینیندا، مەرجی وای هەبوە لە مەرجەکانی موسلیم قورستر بوە. ئاشکرایە کە ئەمە ڕای کۆمەڵێك زانای تریشە(پێشتر باسمانکرد )..(البدایة و النهایة ١٢٣/١١ ).

- ئیبن تاهیر دەڵێ: دەربارەی کەسێکی سەنەدی فەرمودەیەك، لە سەعدی کوڕی عەلی زنجانیم پرسی، گوتی جێمتمانەیە، وتم: بەڵام نەسائی بە لاوازی داناوە! فەرموی: ڕۆڵە، نەسائی مەرجی هەیە لە مەرجی بوخاری و موسلیم قورسترە..(الذهبي: تذكرة الحفاظ ٧٠٠/٢، الحافظ محمد بن طاهر المقدسي: شروط الائمة الستة ل ٢٧ ).

ـ ئیمام نەسائی دەڵێ: کە ویست و عەزمم هاتە سەر کۆکردنەوەی فەرمودەکان لە (السنن) دا، شتێکم لە دڵدا هەبو، کە ڕیوایەتی هەندێك ماموٚستا قبوڵ نەکەم، بەڵام کە نوێژی ئیستیخارەم بۆ کرد، دڵم هاتە سەر ڕیوایەت کردنیان، کە پێشتر ئیهمالم کردبون. (شروط الائمة الستة ل ٢٧ ).

- لە ئیمام ئەبولحەسەنی عەلی کوڕی عومەری دارەقوتنییان پرسی: ئەگەر محمدی کوڕی ئیسحاقی کوڕی خوزەیمە، فەرمودەیەك بگێڕێتەوەو نەسائیش

منتدى إقرأ الثقافي

بیگێڕێتەوە، هی کامیانت پێ بەهێزترە ؟! فەرمووی: ریوایەتی نەسائی بەهێزتر، چونکە بایەخی بە سنەدەکان زیاترە، هەرچەندە ئیبنو خوزەیمە زانایەو پێشەوایەکی بێ وێنەیە، بەلاّم من کەس ناخەمە پێش نەسائیەوە.. (الحافظ محمد بن طاهر المقدسي: شروط الائمة الستة ل ٢٧).

## کۆچی دوایی کردنی ئیمام نەسائی ( رحمه الله )

ئیمام نەسائی رەحمەتی خوای لێ بێت، لە شەعبانی ٣٠٣ ی کۆچیدا لە تەمەنی هەشتاو نۆ، یان هەشتاو هەشت ساڵیدا، کۆچی دوایی کرد.. زانایان لە شوێنی مردنەکەیدا راجوێن، ئیبنو یونس و ئەبو جەعفەری تەحاوی و ئیبنو حەجەری عەسقەلانی لە(تهذیب) ەکەیدا دەفەرمون، لە شاری رەمەلەی فەلەستین کۆچی دوایی کردوە، دەشڵێن لەو ساڵەدایە، بەلاّم دەڵێن لە مانگی سەفەردا بوە. (ابن کثیر: البدایة والنهایة ١١/١٢٤) هەندێکی تر گوتویانە، کە لە نێوانی سەفاو مەروادا، لە مەککە کۆچی دوایی کردووە، لە مەککە بە خاك سپێرراوە.. (ابن کثیر: البدایة والنهایة ١١/١٢٤)، بەلاّم ئیمام زەهەبی رای یەکەمی پێ پەسەندەو دەڵێ، لە رەمەلە کۆچی دوایی کردووەو هەر لەوێش نێژراوە.. (تذکرة الحفاظ ٢/٧٠٠).

منتدى إقرأ الثقافي

## نمونەی فەرمودەیەك لە(سنن النسائي )

كتاب النكاح[١]

باب كيفة الاستخارة ؟!

٣٢٥٣ أَخْبَرَنَا قُتَيْبَةُ قَالَ حَدَّثَنَا ابْنُ أَبِي الْمَوَالِ عَنْ مُحَمَّدِ بْنِ الْمُنْكَدِرِ عَنْ جَابِرِ بْنِ عَبْدِ اللَّهِ قَالَ كَانَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ يُعَلِّمُنَا الِاسْتِخَارَةَ فِي الْأُمُورِ كُلِّهَا كَمَا يُعَلِّمُنَا السُّورَةَ مِنْ الْقُرْآنِ يَقُولُ إِذَا هَمَّ أَحَدُكُمْ بِالْأَمْرِ فَلْيَرْكَعْ رَكْعَتَيْنِ مِنْ غَيْرِ الْفَرِيضَةِ ثُمَّ يَقُولُ اللَّهُمَّ إِنِّي أَسْتَخِيرُكَ بِعِلْمِكَ وَأَسْتَعِينُكَ بِقُدْرَتِكَ وَأَسْأَلُكَ مِنْ فَضْلِكَ الْعَظِيمِ فَإِنَّكَ تَقْدِرُ وَلَا أَقْدِرُ وَتَعْلَمُ وَلَا أَعْلَمُ وَأَنْتَ عَلَّامُ الْغُيُوبِ اللَّهُمَّ إِنْ كُنْتَ تَعْلَمُ أَنَّ هَذَا الْأَمْرَ خَيْرٌ لِي فِي دِينِي وَمَعَاشِي وَعَاقِبَةِ أَمْرِي أَوْ قَالَ فِي عَاجِلِ أَمْرِي وَآجِلِهِ فَاقْدُرْهُ لِي وَيَسِّرْهُ لِي ثُمَّ بَارِكْ لِي فِيهِ وَإِنْ كُنْتَ تَعْلَمُ أَنَّ هَذَا الْأَمْرَ شَرٌّ لِي فِي دِينِي وَمَعَاشِي وَعَاقِبَةِ أَمْرِي أَوْ قَالَ فِي عَاجِلِ أَمْرِي وَآجِلِهِ فَاصْرِفْهُ عَنِّي وَاصْرِفْنِي عَنْهُ وَاقْدُرْ لِي الْخَيْرَ حَيْثُ كَانَ ثُمَّ أَرْضِنِي بِهِ قَالَ وَيُسَمِّي حَاجَتَهُ [٢].

واته: قوتەیبە پێی راگەیاندین گوتی: ئیبنو ئەبول مەوال فەرمودەی لە محمدی کوڕی ئەلونکەدیرەوە، ئەویش لە جابری کوڕی عبداللەوە بۆی گێراوینەتەوە، کە دەیگوت: پێغەمبەرﷺ هەر وەکو، کە سورەتێکی قورئانی فێر دەکردین، ئاواش ئیستیخارەی بۆ هەمو کاروبارێکمان فێر دەکردین، دەیفەرمو: ئەگەر یەکێکتان ویستی کارێك ئەنجام بدات، با نوێژێکی سوننەتی بۆ بکات، پاشان(دوای تەواو بونی نوێژەکە) بپاڕێتەوەو بڵێ: خوایە بەو زانستیەی، کە هەتە سەرپشکت دەکەم، بەو توانایەی، کە هەتە داوای کۆمەکت لێ دەکەم، لەبەر ئەوەی خاوەن فەزڵ و ڕێزیت داوات لێ دەکەم و لێت

---

١ ئێستا ئەم کتێبە بە هەشت بەرگ چاپ کراوە، ئەوەی لەبەردەستی مندایە چاپی مکتب المطبوعات الاسلامیةیە، کە لە ١٤١٤ك / ١٩٩٤ ز دا چاپ بوە.

٢ النسائي : السنن ٦/٨٠و٨١، البخاري ١١/١٥٥ و ١٥٨، ابوداود(١٥٣٨)، الترمذي (٤٨٠)

منتدى إقرأ الثقافي

دەپارێمەوە، خوایە تۆ دەتوانیت و من ناتوانم، تۆ دەزانیت و من نازانم، هەر تۆی کە زانای نادیاریت، خوایە ئەگەر دەزانیت[1] ئەم کارە(ناوی کارەکەی دەڵێت) خێری دین و دنیامی تێدایەو کاری پاشینەی نزیك و دوری کارمی لەسەر دەوەستێت، خوایە بیخەرە قەدەری خۆتەوەو، با بۆم ببێت، خوایە بۆمی ئاسان کەو بەرەکەت و فەڕی خۆتی بخەرە ناو.. ئەگەر دەشزانیت ئەم کارە خراپە بۆم و، زیانی دین و دنیامی تێدایە و پاشینەی کاری نزیك و دورمی بە خراپ لەسەر دەوەستێت، خوایە دڵ و هۆشمی لەسەر لادەو، ئەویش لە دڵ و هۆشی مندا لادە و، بە قەدەری خۆت خێرم بۆ بخەرە شتێکی ترو ڕازیشم کە پێی. ئینجا پێداویستیەکەشی دەڵێت...

---

١ ئەمە ئەوە ناگەیەنێت، کە دودڵ بین لەوەی، کە ئایا خوای گەورە دەزانێت، یان نا، ئەگەر دەزانێت با وامان بۆ بخاتە قەدەری خۆی، ئەگەر واش نازانێت، با جۆرێکی تر بخاتە قەدەری خۆی !! ئەم گومانە کوفرە، بەڵام مەبەستەکە لێرەدا دودڵی ئێمەیە، کە نازانین خوای گەورە کامیانی خستۆتە قەدەری خۆیەوە، بۆیە لێی دەپاڕێینەوە، تا ئەوەمان بۆ بخاتە قەدەری خۆیەوەو بۆمان بهێنێتە دی، کە بە گومانی خۆمان وا دەزانین چاکەیە بۆ ئێمە !!

منتدى إقرأ الثقافي

# ئیمام ئیبنوماجە( رحمه الله )

**(٢٠٩ ـ ٢٧٣ ك )**

## ناو و رەچەڵەكی

ـ حافزی بەناوبانگ محمدی كوڕی یەزیدی رەبعی، ئەبو عبداللەی كوڕی ماجەی قەزوینی[١]. رەبعی: ناوی چەندین هۆزە..

ـ رافیعی لە كتێبی(تاریخ قزوین) ەكەی خۆیدا نوسیوێتی، كە ئیبنو ماجە خۆی ناوی محمدەو، ئیبنو ماجە فارسییەو كونیەی یەزیدی باوكێتی.

ئەوەش هەڵەیە، كە دەوترێت محمدی كوڕی یەزیدی كوڕی ماجە..

## توێژینەوەیەك لە ناوی ئیبنو ماجە

كۆمەڵێك لە زاناو مێژونوسان نوسیویانە ئیبنو(ماجَهْ )، كۆمەڵێكی تر نوسیویانە ئیبنو(ماجَة )، لەوانەی نوسیویانە ئیبنو(ماجَهْ):

١ ـ ئیبنو حەجەری عەسقەلانی لە(فتح الباري) و لە(إرشاد الساري شرح صحیح البخاري) دا.

٢ ـ خەزرەجی لە كتێبی(خلاصة تذهیب تهذیب الكمال في أسماء الرجال ).

٣ ـ توێژینەوەكەی(سنن ابن ماجة) ی چاپخانەی العلمیة لە میسر، كە لە ١٣١٣ ك چاپی كردوە.

---

١ ابن حجر العسقلاني : تهذيب التهذيب٩/٥٣٠ ،الحافظ الذهبي: تذكرة الحفاظ٢/٦٣٦، ابن الجوزي: المنتظم٥/٩٠، ابن خلكان: وفيات الاعيان٤/٢٧٩، ابو الفلاح عبدالحي بن العماد الحنبلي: شذرات الذهب في أخبار من ذهب٢/١٦٤، ابن كثير: البداية و النهاية ١١/٥٢.

منتدى إقرأ الثقافي

٤ ـ(منتخب كنز العمال) لە داوێنی(مسند أحمد ).

٥ ـ كتێبی(كشف الخفاء و مزيل الالباس ).

٦ ـ النابلسي: (ذخائر المواريث في الدلالة على مواشع الحديث ).

٧ ـ السيد جمال الدين القاسمي: (قواعد التحديث من فنون مصطلح الحديث ).

٨ ـ الشيخ أحمد محمد شاكر: (التعريف بكتاب مفتاح كنوز السنة ).

٩ ـ(شرح ألفية العراقي ).

١٠ ـ كۆمەڵێك رۆژهەڵاتناس: (المعجم المفهرس لألفاظ الحديث الشريف ).

١١ ـ المنذري: (الترغيب و الترهيب ).

١٢ـ الفيروزئابادی خاوەنی فەرهەنگی (قاموس المحيط) لە ماددەی(م و ج) دا نوسيوێتی: (ماجَة) نازناوی باوكی محمدی كوڕی یەزیدی قەزوینی، خاوەنی كتێبی(السنن) ە.

١٣ـ الزوبەیدیش لە فەرهەنگی(تاج العروس) هەر وەكو فەیروزئابادی نوسیوەو، پاشان نوسیوێتی: قەولێكی تریش هەیە، كە گوایە ماجە ناوی دایكی محمدی كوڕی یەزیدی قەزوینیە.

١٤ـ ئیبنو خەلەكان نوسیوێتی: ئیبنو ماجە، كە فەتحە لەسەر میم و جیمەكەیەو، ئەلفێك لە نێوانیانیاندایە، لە كۆتاییدا هائەو سكونی لەسەرە. گومانی تێدا نیە، ئەم زەبتو ڕەبتەی ئیبنو خەلەكان وردەكارانەترە..

ئەمما ئەوانەی وتویانە، كە(ئیبنو ماجَة) یە:

١ـ هەر ئیبنو حەجەری عەسقەلانی لە هەردو كتێبی(تقريب تهذيب التهذيب و تهذيب التهذيب).

٢ـ ئیبنو تەیمیە لە كتێبی(المنتقى)، كە ساڵی ١٣٣٧ ك لە چاپخانەی الرحمانی دەهلی هیندستان چاپ كراوە.

٣ـ اليافعی لە كتێبی(مرآة الجنان)، كە لە ١٣٣٤ ك لە حەیدەرئابادی هیندستان چاپ كراوە.

منتدى إقرأ الثقافي

٤ ـ الشيخ محمد أحمد شاكر لە كتێبی(مسند احمد) چاپی دوەمی.

٥ ـ أمين واصف بيك لە كتێبی(الفهرست ).

هەرچەندە هەردو لەفزەکە خاوەنیان هەیە، لەسەری هەڵبدەنێ، بەڵام من ئیبنو(ماجَة) کەم بەلاوە راسترە، چونکە توێژینەوەو بەڵگەی ئەوانەی وایان گوتوە، بەهێزتر دەبینم...

## لە دایکبونی

زۆرینەی زۆری زانایان لەسەر ئەوە رێکن، کە ئیبنو ماجە لە ساڵی دوسەدو نۆی کۆچی(٢٠٩ ك / ٨٢٤ ز) لە قەزوین لە وڵاتی فارس لەدایکبوە.. قەزوین لە سەردەمی سەیدنا عوسمانی کوڕی عەففاندا ئازاد کراو، یەکەمین والی ئەوێ سەیدنا بەڕائی کوڕی عازب بو، کە لە ساڵی ٢٦ ی کۆچیدا بو بە والی..

## زانایان و مەتحی ئیبنوماجە

ئیمام ئیبنوماجە یەکێکە لە ئەستێرەی زانست وشەرعی سەردەمی خۆی، کە بە حافز بەناوبانگبو، حافزی فەرمودەکانی پێغەمبەرﷺ، پسپۆڕی فەرمودەوانی بو، شارەزای رێگاکانی سەنەدی فەرمودەکان بو، بۆیە زۆر لە زانایان و شەرعناسان مەتحیان دەکرد، لەوانە:

ـ حافز ئیبنو کەثیر دەربارەی دەڵێ: ئەبو عبدالله محمدی کوڕی یەزید ئیبنو ماجە، خاوەنی کتێبی(السنن) ە بەناوبانگەکەیە، کە بەڵگەیە لەسەر بەرفراوانی زانینی ئەو و، قوڵیی فەرمودەناسی و شوێن پێ هەڵگرتنەوەی سوننەت، لە بنج ولقەکانی دیندا. (البداية و النهاية ٥٢/١١).

ـ ئیبنو خەلەکان دەربارەی ئیبنو ماجە دەیگوت: حافزی بەناوبانگ خاوەن کتێبی(السنن) لە فەرمودەوانیدا... (وفيات الاعيان ٢٧٩/٤ ).

منتدى إقرأ الثقافي

ـ ئیمام زەهەبی دەربارەی گوتویەتی: ئیبنو ماجە فەرمودەناسی هەمو ئەو ولاَتانەیە.(تذكرة الحفاظ ٦٣٦/٢ ).

ـ ئەبو یەعلای خەلیلی دەڵێ: ئیبنو ماجە جێمتمانەیە ، هەمو لەسەر زانست و تەقوای ئەو رێکن، بە بەلگە دەیهێننەوە، کە زانیاری لەسەر فەرمودەوانی زۆرەو، حافزێکی گەورەیە.(تهذيب التهذيب ٥٣٠/٩ ).

ـ ئیبنو ناسرووددین دەفەرموێ: ئیبنو ماجە، مەولای قەزوینیان، یەکێکە لە پێشەوایانی ناودار، خاوەن(السنن)ە کە یەکێکە لە سەرچاوەکانی فەرمودە، بە راستی ئیبنو ماجە حافز بو، جێمتمانەیەکی مەزن بو..(سنن ابن ماجة/تحقيق محمد فؤاد عبدالباقي ١٥٢٥/٢).

## گەشتی زانست و فێربون

سەردەمی ئیمام ئیبنوماجە، سەردەمی گەشتی کۆکردنەوەی فەرمودە بو، گەشتی فەرمودە لە یاوەرانەوە هاتبو، چونکە یاوەرێکی ئازیزی وەکو جابری کوڕی عبدالله، بۆ وەرگرتنی یەك فەرمودە، مانگە رێیەك رۆیشت، تا گەیشتە لای عبداللەی کوڕی ئونەیس، تا لێوەی فێر ببێت! دواتر ئەمە بوە باوی سەردەم، ئەو فەقێیەی زۆرتر بگەڕاباو شێخ و زانای زیاتر ببینیایەو، زیاتر فێر ببوایە، پلەوپایەی لە ناو زانایاندا بەرزتر دەبۆوە، بۆیە دەبینیت ئیمامێکی بەڕێزی وەکو ئیمام بوخاری، بۆ هاندانی موسوڵمانان بۆ وەرگرتنی زانستی شەرعی لە سەحیحەکەی خۆیدا، بابێکی تەرخان کردوە بۆ ئەو فەرمودانەی، کە موسوڵمانان بۆ وەرگرتنی زانستی هان دەدەن!

لە سەردەمانی ئیمام ئیبنوماجەدا، شارە بەناوبانگەکانی ولاَتی موسوڵمانان، مەنارەی کەمەندکێشی زانایان بون، ئیبنو ماجەش لە تەمەنی بیستودو ساڵیدا لە ساڵی(٢٣٠ ك / ٨٤٤ ز) بۆ وەدەست هێنانی زانستی شەرعی، گەشتی بۆ زۆر

منتدى إقرأ الثقافي

ولآت کردوە، خۆی گەیاندۆتە زۆرینەی مەڵبەندەکانی زانست و شارستانێتی ئەو سەردەمەی جیهانی موسوڵمانان، لە قەزوینەوە چوە بۆ خۆراسان و عێراق و بەسرەو کوفەو بەغداو دیمەشق و مەککەو مەدینەو میسرو ڕەی و ولآتانی تر، زۆرێك لە زانایان و مێژونوسان، باسیان لەم گەشت و شوێنانە کردوە، کە ئیمام ئیبنوماجە بۆیان چوە.

## مامۆستاکانی ئیبنو ماجە

ئیمام زەهەبی لە کتێبی(التذکرة ٦٣٦/٢) ەکەی خۆیدا دەڵێ: ئیبنو ماجە زانستی لەم زانایانەوە وەرگرتوە: ئیبراهیمی کوڕی مونزیر حوزامی، کە فەقێی ئیمام بوخاری بو(ساڵی ٢٣٦ ك کۆچی دوایی کردوە) محمدی کوڕی عبداللەی کوڕی نومەیرو، جەببارەی کوڕی ئەلوغلیس و، عبداللەی کوڕی معاویەو، هیشامی کوڕی عەممارو، محمدی کوڕی رمح و، داودی کوڕی رەشیدو، زوبەیری کوڕی بەتتارو، ئیسماعیلی کوڕی موسای فیزاری و هاوئاستەکانیان. (تذکرة الحفاظ ٦٣٦/٢)..

ئەبولفەلاح عەبدوالحەی کوڕی ئەلعیمادی حەنبەلی دەڵێ: ئیبنو ماجە فەقێی ئەبوبەکری کوڕی ئەبوشەیبەو، یەزیدی کوڕی عبداللەی یەمامی و، ئەو ئاستانە بوە. (شذرات الذهب في أخبار من ذهب ١٦٤/٢ )..

## فەقێکانی ئیبنو ماجە

ئیمام ئیبنوماجە دوای ئەوەی پازدە ساڵ، لە پێناوی وەرگرتنی زانستی شەرعیدا، بەتایبەتی فەرمودەوانی، غوربەتی چێشت، بە زانایییەوە گەڕایەوە قەزوین و، بو بە یەکێك لە هەرە بەناوبانگەکانی فەرمودەوانی لە قەزوین.. ئیمام زەهەبی دەربارەی فەقێکانی ئیمام ئیبنو ماجە دەڵێ: ئەوانەی زانستییان لە ئیبنوماجەوە وەرگرتوە زۆرن، لەوانە محمدی کوڕی عیسای

منتدى إقرأ الثقافي

ئەبهەری و، ئەبو عەمرو ئەحمەدی کوڕی محمدی کوڕی حەکیم و، ئەبولحەسەنی قەتتان و، سولەیمانی کوڕی یەزیدی قەزوینی و، ئەحمەدی کوڕی ڕۆحی بەغدادی و هی تریش..(تذكرة الحفاظ ٦٣٦/٢ ).

حافز ئیبنوحەجەری عەسقەلانیش، کۆمەڵێك لە فەقێکانی ئیمام ئیبنو ماجە باس دەکات، لەوانە: عەلی کوڕی سەعیدی کوڕی عبداللەی ئەغەدانی و، ئیبراهیمی کوڕی دیناری الجەرشی هەمەدانی و، ئەحمەدی کوڕی ئیبراهیمی قەزوینی، کە باپیرانی حافز ئەبو یەعلای خەلیلی و، ئیسحاقی کوڕی محمدی قەزوینی و، جەعفەری کوڕی ئیدریس و، حوسەینی کوڕی عەلی کوڕی بەرانیاو، ئەبولحەسەن عەلی کوڕی ئیبراهیمی کوڕی سەلەمەی قەزوینی حافزو هی تریش.. (تهذيب التهذيب ٥٣١/٩ ).

## کتێبەکانی

ئیمام زەهەبی لە کتێبی (تذكرة الحفاظ ٦٣٦/٢) دەربارەی کتێبەکانی ئیمام ئیبنوماجە دەفەرموێ: حافزی مەزن، موفەسسیری قورئان، ئەبوعبداللە محمدی کوڕی یەزید، خاوەنی چەندین کتێبی فەرمودەوانی و تەفسیرو مێژو، موفتی گەورەی ئەو وڵاتی قەزوینەیە.

ئیبنوخەلەکان لە کتێبی (وفيات الاعيان ٢٧٩/٤) و ئەبولفەلاح عبدالحەی العیمادی حەنبەلیش، لە کتێبی(شذرات الذهب في أخبار من ذهب ١٦٤/٢) دا دەڵێن: ئیبنو ماجە خاوەنی تەفسیرێکی بە نرخی قورئانی پیرۆزو، کتێبی مێژو فەرمودەیە، کتێبی السننەکەی یەکێکە لە سوحاحی ستتە (ئەو شەش کتێبەی لای ئەهلی سوننەت و جەماعەت ڕاستترین کتێبی فەرمودەن). بەڵام بە داخەوە، وا دیارە ئەو تەفسیرو مێژوەی بزر بوبێت! ئیمام ئیبنو کەثیر لە تەفسیرەکەی خۆیدا مەتحی تەفسیرەکەی ئیبنوماجە دەکات، بۆ تەفسیرەکەشی دەڵێ: مێژویەکی تەواوە نوسیوێتیەوە، هەروەها سیوتیش کە لە ساڵی ٩١١ ی

منتدى إقرأ الثقافي

کۆچیدا کۆچی دوایی کردوه، لە کتێبی(الاتقان في علوم القران) ەکەی خۆیدا، مەتحی تەفسیرەکەی ئیبنو ماجە دەکات، کە تەفسیرێکی نایابە... حافز ئیبنو تاهیری مەقدیسیش، کە لە ٥٠٧ ك کۆچی دوایی کردوه، باس لە کتێبی مێژوەکەی ئیبنوماجە وا دەکات، کە مێژویەکی بەرفراون و شتی سەرسورهێنەری تێدایە، نوسخەیەکم لێ بینیوە کە حاشیەی جەعفەری کوڕی ئیدریسی بەسەرەوە بو کە فەقێی ئیبنوماجە بوە... ئیبنو، خەلەکانیش لە(وفیات الاعیان )ەکەی خۆیدا هەر مەتحی ئەو مێژوەی ئیبنوماجە دەکات... بەلاّم بە داخەوە دیارە، کە لەگەلّ ئەو هەمو کەلەپورە زانستی و شارستانێتیەدا، فەوتاون، کە سەردەمانی دواکەوتویی ئەم ئوممەتە دا ڕویدا !بێگومان ئەوەی، کە ئیبنوماجەی زیاتر بەناوبانگ کرد کتێبی (السُنَن) ە.

## کتێبی( السنن )ی ئیمام ئیبنوماجە •

دوای ئەوەی ئیمام ئیبنوماجە لە تەواوکردنی کتێبی(السنن) ەکەی بوەوە، بردیە لای کۆمەلّێك زانای فەرمودەوانی و نیشانیدان، تا بۆی هەلّسەنگێنن. ئیمام زەهەبی ڕەحمەتی لێ بێت لە(تذكرة الحفاظ ٦٣٦/٢)دا، هەرچەندە دەربارەی کتێبی السننی ئیمام ئیبنو ماجە گوتویەتی: (٣٠) سی فەرمودەی زەعیفی تێدایە، ئەوەی گێڕاوەتەوە کە ئیبنو ماجە دەلّێ: یەکێك لەوانەی کتێبی (السنن)م نیشان دا، ئیمام ئەبو زەرعە بو ڕەحمەتی خوای لێ بێت، ئەبو زەرعە، کە کتێبەکەمی بینی گوتی: وا گومان دەبەم، کە ئەگەر ئەم کتێبە بلاّوببێتەوەو بکەوێتە بەر دەستی خەلّکی ئەم مزگەوتانە، هەرچەند زۆریشن چۆلّ دەبن! واتە ئیتر فەقێکان پێویستیان بە حەلەقاتی دەرسی مزگەوت نامێنێت !!

جا با بزانین ئیمام ئەبو زەرعە کێیە، کە وای گوتوە ؟! ئەبو زەرعەی رازی، ئیمامێکی گەورەی فەرمودەوانیەو، سالّی ٢١٠ ك لە شاری ڕەی (خۆراسان)

منتدى إقرأ الثقافي

لەدایك بوە، یەكێكە لەو چوار زانا گەورانەی، كە زیاتر لە شەش سەد هەزار فەرمودەیان لەبەر بوە، ئەوانیش ئیمام ئەحمەدو بوخاری و موسلیم و ئەبو زەرعەن.. ئەبو زەرعە لە تەمەنی سیودو ساڵیدا دەیگوت: دوسەد هەزار حەدیسم لەبەرە وەكو، كە (قل هو الله احد)م لەبەرە.. ئاخر بۆیە پێی وتراوە سید الحفاظ.

## كتاب و باب و بابەتەكانی سونەنی ئیبنوماجە

كتێبی (السنن)ی ئیمام ئیبنوماجە رەحمەتی خوای لێ بێت، زۆر گشتگیرو كۆیە، ریزبەندی بابەت و بابەكانی زۆر جوان كردوە، محمد فوئاد عبدالباقی ڕەحمەتی، كە توێژەرەوەی سونەنی ئیبنو ماجەیە، لە پێشەكیەكەیدا گوتویەتی:

- ئیمام ئیبنو ماجە، كتێبەكەی، بێجگە لە پێشەكیەكەی، كردوە بە(٣٧) سیوحەوت بەشەوە، كە وەكو عادەتی زانایانی كۆن، ناوی ناون كتاب..

- هەر كتابێكی كردوە بە بەشی تر و ناوی ناون باب، كتێبەكە(١٥١٥) هەزارو پێنج سەدو پازدە بابە..

- ژمارەی فەرمودەكانی ناو كتێبەكە،(٤٣٤١) چوار هەزارو سێ سەدو چلو یەك فەرمودەیە،(٣٠٠٢) سێهەزارو دو فەرمودەیان لە پێنج كتێبەكەی تری سوحاحی ستتەدا هەیە، ئەو(١٣٣٩) هەزارو سێسەدو سیونۆ فەرمودەیە، كە دەمێنێتەوە زیادەیەو، لە پێنج سوحاحەكەی تردا نیە، لەم زیادانە(٤٢٨) چوار سەدو بیستوهەشت فەرمودەیان سەنەدیان سەحیحەو، پیاوانی سەنەدەكانیان جێمتمانەن(ثقات)ن. ئاستی(١٩٩) سەدو نەوەدونۆ فەرمودەیان حەسەنەو،(٦١٣) شەش سەدو سێزدە فەرمودەشیان زەعیفن ز(٩٩) نەوەدونۆ فەرمودەشیان، یان زۆر لاوازن، یان هەڵبەستراون..

منتدى إقرأ الثقافي

شێخ محمد فوئاد عبدالباقی ڕەحمەتی دوای ئەمە دەڵێ: کتێبێك سێ هەزارو دو فەرموده لە خۆ بگرێت، کە لە لای پێنج لە سوحاحی ستتە هەبن، کە ئیبنو ماجە هەر هەموی بە سەنەدی غەیری سەنەدەکانی ئەوان گێڕابێتەوەو، هەر ڕێگایەکی سەنەدی گێڕاوەکانیش، پشتگیریی سەنەدەکانی دیکە بکات و، فەرمودەکان بەهێزتر کات، لەسەر ئەوانەشەوە، بڕی(٤٢٨) چوارسەدو بیستوهەشت فەرمودەی تری سەحیح ریوایەت کات، کە پیاوانی سنەدەکانیان هەمویان جێمتمانە بن، ئینجا(١٩٩) سەدونەوەدونۆ فەرمودەی دیکە ریوایەت کات کە سنەدەکانیان حەسەن بن، بە ڕاستی کتێبی وا شایانی ئەوەیە نرخ و بەهای بێ سنوری هەبێت...

- ئەبو یەعلای خەلیلی دەڵێ: سونەنی ئیبنوماجە کتێبی چاکە، ئەگەر ئەو فەرموده زەعیفانەی تێدا نەبوایە، هەرچەندە زۆریش نین...

- ئەو فەرمودانەی کە ئیمام ئیبنولجەوزی لە کتێبی سوننەکەی ئیبنو ماجەدا بە زەعیفی داناون، نزیکەی(٣٠) سی فەرمودەن. سوننەنی ترمزیشی وا لێکردوەو هەر ئەوەندەی بە زەعیف هەژمارد کردوە، بەڵام ئەوەی لە سونەنی ئیبنوماجەدا، بە پێی مەرجەکانی شەش ئیمامەکەی فەرموده، بە زۆر زەعیف هەژمارد دەکرێت، ناکاتە سێیەکی لاوازەکانی..

## یەکەمین کەس کە سونەنی ئیبنو ماجەی خستە ڕیزی سیحاحی ستتەوە

یەکەمین کەس، کە سونەنی ئیبنوماجەی خستە ڕیزی سەرچاوەکانی فەرمودەی ڕاستەوەو، بە سونەنی ئیبنوماجە کردنی بە شەش و، بونە سوحاحی ستتە(کە بریتین لە سەحیحی بوخاری و سەحیحی موسلیم و سونەنی هەر یەك لە ئەبوداودو ترمزی و نەسائی و ئیبنوماجە ).. حافز ئەبولفەزلی کوڕی تاهیر بو، ئینجا زانایانی دیکەش ئەو ریزبەندیەی ئەویان قبوڵ کردو پێوەی پابەند بون. زانای بەناوبانگ عەللامە عبدالغەنی نابولسی

منتدى إقرأ الثقافي

کـە سـاڵی(١١٤٣: ١٧٣٠ ز) کۆچـی دوایـی کـردوە، لـە پێـشەکی کتێبەکـەی خۆیدا(ذخائر المواريث في الدلالة على موضع الحديث) دەڵێ: خەڵکی لەوەدا راجوێ بـون، کـە ئایـا سـونەنی ئیبنوماجـە شەشـەم کتـێبی سـیحاحی سـتتەیە، یـان پێنجەمینیانــە ؟ لای رۆژهەڵاتیــەکان (خــەڵکی رۆژهــەڵاتی ئوممــەتی ئــەو سەردەمەی ئیسلام)، کتـێبی سونەنی ئیبنوماجەی قەزوینی شەشـەمینەو، لـە پێش(موطأ)ی ئیمام مالیکەوەیـە، بـەڵام لای رۆژئاواییـەکان (خـەڵکی رۆژئـاوای ئوممـەتی ئـەو سـەردەمەی ئیسلام)، کتـێبی(موطأ)ی ئیمـام مالیـك لـە پێـشترە، بەڵام زانایانی دواییـن لەسەر ئەوە رێکن، کە سونەنی ئیبنوماجەپێش(موطأ)ی ئیمـام مالیکـەو، یەکێکیـشە لـە سوحاحی سـتە، چـونکە دابەشـکردنەکەی لـە دابەشکاری(موطأ)ی ئیمام مالیك رێکوپێك ترەو، بابەتیشی زۆرترن...

سـەخاویش گوتویـەتی: سـونەنی ئیبنوماجـە بـەوە چۆتە ریـزی سـیحاحی ستتە، کە فەرمودەی سەحیحی زیادەی وای تێدایە، کـە لـە پێـنج سـەحیحەکەی تردا نین...

## کۆچی دوایی کردنی ئیمام ئیبنو ماجە

ئیمام زەهەبی لە (تذكرة الحفاظ ٦٣٦/٢) دا دەڵێ: (كانـت وفاتـه لثمـان بقـين مـن رمـضان سـنة ثلاث و سـبعين و مـائتين) ئیبنوماجـە، کـە کۆچـی دوایـی کـرد ڕەمەزانی ساڵی دوسەدو حەفتاو سێی کۆچی هەشت ڕۆژی مـابو تـەواو ببێـت.. ڕەحمـەتی خـوای لـێ بێـت.. زانایـانی پێـشین ئـاوا بـەرواریان نوسـیوەتەوە. بـە هەژماردنی ئێمەش دەکاتە ٢٧٣/١٠/٢٤ ك.

ـ شـێخ محمـد فوئـاد عبـدالباقی، کـە توێـژەرەوەی سـونەنی ئیبنوماجەیـە، لەپێشەکی کتێبەکەدا نوسیوێتی، کە کۆچی دوایـی ئیبنوماجـە لـە دوشـەممەدا بو، بەڵام بەگۆڕسپاردنی لە سێشەممەدا بو، کە هەشت ڕۆژ مابو ڕەمەزانی ساڵی دوسـەدو حەفتاوسـێی کۆچـی تـەواو ببێـت.. ئەبوبـەکری کـوڕی نوێـژی لەسـەر

منتدى إقرأ الثقافي

کـردو، عبداللـەی کوڕیـشی سەرپەرشـتی کفـن و دفـن کردنـی کـرد.. ئیبنـو حەرجـەرو ئیبنوخەلـەکان و ئەبولفـەلاح ئیبنـو عیمـادیش، هـەر وایـان نوسیوە.(ابن حجر العسقلاني: تهذيب التهذيب ٥٣٠/٩، ابـن خلكـان: وفيات الاعيان ٢٧٩/٤، ابو الفلاح عبدالحي بـن العمـاد الحنبلي: شـذرات الـذهب في أخبـار مـن ذهـب ١٦٤/٢ ).

## هەندێك لە شەرحەکانی سونەنی ئیبنو ماجە

کتـێبی سـونەنی ئیمـام ئیبنوماجـەش، وەکـو هـەر سەرچـاوەیەکی تـری فەرموده، دەیان زانای تری فەرمودەوانی ڕاڤە(شەرح) یان کردوّتەوەو بایەخیان پێداوە، لەو کتێبانەی ڕاڤەی سونەنی ئیبنو ماجەیە:

١ـ شرح سنن ابن ماجه/للحافظ علاء الدين مُغَلطاي(٧٦٢ك =١٣٦٠ز ).

٢ـ ما تمس إليه الحاجة على سنن ابن ماجه/سـراج الـدين عمـر بـن علـي بـن الملقـن (٨٠٤ ك - ١٤٠١ز) شـەرحی ئـەو فەرمودانەیـە، کـە تـەنها لای ئیمـام ئیبنوماجە هەن و، لای ئەوانی تری سوحاحی ستتە نین..

٣ ـ الديباجة في شرح سنن ابـن ماجـه/الـشيخ كمـال الـدين محمـد بـن مرسـي الدبيري (٨٠٨ ك ـ ١٤٠٥ز ).

٤ ـ مصباح الزجاجة في شرح سنن ابن ماجه/جلال الـدين الـسيوطي (٩١١ ك ـ ١٥٠٥ز).

5 ـ شـرح سـنن ابـن ماجـه/المحـدث محمـد بـن عبـد الهـادي الـسندي(١١٣٨هـ= ١٧٢٥م).

یەکـەمین جـار، کـە کتـێبی سـونەنی ئیمـام ئیبنوماجـە بـە چـاپکراوی بڵاوکرایەوە، لـە هیندستـانەوە بـو، لـە ساڵی ١٢٦٤ ك / ١٨٤٧ ز لـە شاری دەهلی چاپ کرا، کە دو حاشیەی[١] بەسەرەوە بو: یەکـەمیان: (مـصباح الزجاجة) بـو کـە

---

١حاشیە : شەرحی کتێبێکە، کە لەخوارەوە، تەنیشتی دەقی نەسڵی کتێبەکەوە دەنوسرێن..

منتدى إقرأ الثقافي

سیوتی نوسیوێتی، دوەمیشیان: (انجاح الحاجة) ی مەولەوی عبدالغەنی دەهلەوی بو. دوای ئەمە چاپی قاهیرە بو، کە لە ساڵی(١٣١٣ ك / ١٨٩٥ ز) دا بو،(حاشیة السندي) بەسەرەوە بو، کە شەرحێکی کورتو پوختە، بایەخ بە ئیعراب و وردەکاری کۆڕانی سەرفیانەی وشەکانی دەدات. دوای ئەمانە شەرحە عیلمیە ئەکادیمیانەکەی شێخ محمد فوئاد عبدالباقی دێت، کە بە دو بەرگی گەورە لە ساڵی(١٣٧١ ك / ١٩٥١ ز)دا چاپی کرد. شێخ فوئاد ژمارەی بۆ هەر کتاب و باب و فەرمودەیەك داناوەو لە کۆتاییدا ناوەرۆك(فەهرست)ی بۆ کردوە، کە بە ئاسانی خوێنەر دەباتەوە سەر فەرمودەکە...

## نمونەی فەرمودەیەك لە(سنن ابن ماجة )

**كتاب الفتن**[1]

**باب الوقوف عند الشبهات**

عَنِ النُّعْمَانِ بْنِ بَشِيرٍ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا قَالَ: سَمِعْتُ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ يَقُولُ: )إِنَّ الْحَلَالَ بَيِّنٌ وَإِنَّ الْحَرَامَ بَيِّنٌ، وَبَيْنَهُمَا أُمُورٌ مُشْتَبِهَاتٌ، لَا يَعْلَمُهُنَّ كَثِيرٌ مِنَ النَّاسِ، فَمَنِ اتَّقَى الشُّبُهَاتِ اسْتَبْرَأَ لِدِينِهِ وَعِرْضِهِ، وَمَنْ وَقَعَ فِي الشُّبُهَاتِ وَقَعَ فِي الْحَرَامِ، كَالرَّاعِي يَرْعَى حَوْلَ الْحِمَى يُوشِكُ أَنْ يَرْتَعَ فِيهِ، أَلَا وَإِنَّ لِكُلِّ مَلِكٍ حِمًى، أَلَا وَإِنَّ حِمَى اللَّهِ مَحَارِمُهُ، أَلَا وَإِنَّ فِي الْجَسَدِ مُضْغَةً إِذَا صَلَحَتْ صَلَحَ الْجَسَدُ كُلُّهُ، وَإِذَا فَسَدَتْ فَسَدَ الْجَسَدُ كُلُّهُ، أَلَا وَهِيَ الْقَلْبُ ).

واتە: لە نوعمانی کوڕی بەشیرەوە‌ﷺ هاتوە، کە دەڵێ: گوێم لێبو پێغەمبەرﷺ دەیفەرمو: حەڵاڵ دیارەو ئاشکرایە، حەرامیش دیارەو ئاشکرایە،

---

١ ئەم فەرمودەیە، فەرمودەوانی تریش گێڕاویانەتەوە، لەوانە : بوخاری لە سەحیحەکەی خۆی لە كتاب الايمان/ باب فضل من استبرا لدينه(١٢٦/١) ژمارە (٥٢)، موسلیم لە كتاب المساقاة / باب أخذ الحلال وترك المشبهات ژمارە(١٥٩٩ )، و ئەبو داود لە كتاب البيوع (٢٤٧/٢) و ترمزیش لە كتاب البيوع (١٩٨/٥) و نەسائیش هەر لە كتاب البيوع (٢١٣/٧)، هەروەها دارمی لە كتاب البيوع (٢٤٥/٢).

منتدى إقرأ الثقافي

لە نێوانیانیشیاندا گومانلێکراو هەن، زۆر کەس نایانزانن، هەر کەسێك خۆی لە گومانلێکراوەکان بەدور بگرێت، ئەوە دین و ئابڕوی خۆی پاك پاراستوە، هەر کەس بکەوێتە گومانلێکراوەکانەوە، ئەوە دەکەوێتە حەرامەکانیشەوە. چونکە شوانێك ئاژەڵەکانی هەر لەدەوروبەری باخێك بلەوەڕێنێت، حەتمەن دەچنە ناوی.. دەی با بزانن، کە وەك چۆن هەمو پاشایەك موڵکی تایبەتی خۆی هەیە(کە سنوریان بۆ کێشراوە)، خوای گەورەش موڵکی تایبەتی خۆی هەیە، موڵکەکەی خوای گەورە ئەو موحەڕاماتانەیە، کە دیاری کردون کە نابێت کەس توخنیان کەوێت، یان سنوریان ببەزێنێت. با بشزانن، کە هێندەی پارویەك لە جەستەدا هەیە، کە ئەگەر ئەو سوڵحا هەمو جەستە دەسوڵحێت، ئەگەر ئەو پیس بو، هەمو جەستەش پیس دەبێت، ئەویش دڵە...

## ئەوی لەم فەرمودەیەوە وەردەگیرێت

١ـ حەڵاڵ و حەڕام لە ئیسلامدا دیاری کراون، موسوڵمانان پێویستە زو شارەزای جۆرو ڕادەو سنوریان بن.

٢. نێوان حەڵاڵ و حەڕام گومانلێکراو هەن، کە پێویستە موسوڵمانی دیندار خۆیان لێ بە دور بگرێت، نەبادا بکەوێتە ناوی و، دواتر حەزو نەفسی لای ئاسایی بکەن و جورئەتی گوناحکردنی پێ بدەن و، دواتر رایکێشنە ناو حەڕامەوە..

٣ـ خۆ گرتنەوەی موسوڵمان لە گومانلێکراوەکان، تەقواو دینداریی و پارسەنگیەو، زیاتر پابەندی دینی، لای موسوڵمان دروست دەکات.

٤ـ دڵ پاتری جەستەیە، سەرچاوەی وزمیەتی، ئەگەر ئەو بە خواناسی شەحن بوبۆوە، ئەوە بەهێزەو جەستەش وەکو ڕەفتارو ڕەوشت بە پابەندبون بە سنوری شەرعەوە بەهێز دەکات... ئەگەر لە خواش غافڵ بو، دینداریتی کەم

منتدى إقرأ الثقافي

بو، حەتمەن جەستەش زۆر پابەند نامێنێت بە شەریعەتی خواوەو، ڕەفتارو ڕەوشتەکەش دەبێتەوە بە ڕەوشتی جاهیلیی...

٥ـ حەلاڵ خواردن و خۆپاراستن لە حەرام، دەبێتە مایەی تەقواو بەهێزبونی دڵ، ئەوەش یەعنی بەهێزکردنی دینداریيەکە... بە پێچەوانەشەوە حەرامخۆریی، دەبێتە مایەی دڵ ڕەقی و سستی دینداریی و، جورئەت بون بۆ بەزاندنی سنوری شەرع. خوا لاماندا...

٦ ـ موسوڵمان دەبێت حسێب بۆ قسەو قسەڵۆکی خەڵکیش بکات، چونکە زۆر قسەکردن لەسەر کەسێك، کەسایەتی لاواز دەکات و لە بەرچاوی خەڵکی دەخات، کە ئەوەش زۆر بو، کاریگەریی کارو بانگەوازو ئامۆژگاری ئەو موسوڵمانە، لای خەڵکی لاواز دەبێت...

تەواو بو والحمد لله

منتدى إقرأ الثقافي

# ناوەڕۆك



منتدى إقرأ الثقافي